زوهێر جەزائیری

# بەر لە ئەنفال...
# دوای لە یاد چوون

وەرگێڕانی: جومعە جەباری

منتدى إقرأ الثقافي
WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM
منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
للكتب ( كوردى ,عربي ,فارسي )

زوهێر جەزائیری

# بەر لە ئەنفال..
# دوای لە یاد چوون

وەرگێڕانی:

جومعە جەباری

ناوی کتێب: بەر لە ئەنفال... دوای لەیادچوون

نووسینی: زوهێر جەزائیری

وەرگێرانی: جومعە جەباری

بڵاوکراوەی ئاراس – ژمارە: ٧٧٠

دەرهێنانی ناوەوە: هونەر مەرجان

بەرگ: مریەم متەقیبیان

چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٧٣٦ی

ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# پێشەکی

١٨ ساڵ مەودای نێوان حاجی حەسەن و کارەساتەکەیە، کەچی ورد و درشتی ڕووداوەکە هێشتا لە هزریدا وەك خۆی ماوەتەوە.. زیڕەی منداڵ، نەڕەنەڕی جاشەکان، شەقەشەقی چەکەکان، ئینجا جووڵەی ئۆتۆمبێلەکان. لە چەند چرکەساتێکی وەك ئاخر زەماندا هەموو خزمەکانی لە ناو تەپوتۆزێکدا بزر بوون. ئێستاش زیڕە و دیمەنەکان، لە خەوندا، یا لە چرکەساتێکی بێدەنگی لەگەڵ خودا، هەموو ڕۆژێك دووبارە دەبنەوە..

کاتێك دادگاییکردنەکەی عەلی حەسەن مەجید دەستی پێ کرد، حاجی حەسەن بەرامبەر تەلەفزیۆنەکە وەستا، تەماشای ئەم پیاوە قژ سپییە سەرشۆڕە، چاو ئاوساوە، دەنگ لاوازەی دەکرد... یەکەم جار هەستی بەقین نەکرد، بەڵکو دەیویست ئەگەر لە جێگەی دادوەرەکە بووایە پرسیاری لێ بکات:

– لە کوێن؟ ئایا زیندەبەچاڵ کران، یا گوللەباران کران، ئەی زۆر ئەشکەنجە دران پێش مردنیان، ئەی چی بەسەر ئەو دوو منداڵەدا هات، کە لەگەڵ دایکەکەیان بردران؟

حاجی حەسەن ناتوانێت لێبووردە بێت، چونکە لێبووردەیی پێویستی بە لە یادکردن دەبێت، کەچی دادوەری پێویستی بە وەبیرهێنانەوەیە. جەلاد پێویستی بەم هەموو کاتەی حاجی حەسەن نییە، پێویستیشی بەو هەموو سۆزەی نییە، چونکە ئەم سەرقاڵە بەقوربانییەکانەوە و دەیەوێت

چارەنووسیان بزانێت، یا بەڵگەیەك ئاماژە بەپاشماوەكانیان بكات، هێوریش نابێتەوە ئەگەر گۆڕیان نەدۆزێتەوە.

حاجی حەسەن بەسەرسوڕمانەوە بەشەقامەكانی شاردا دەگەڕێت، كە دەبینێت خەڵك لە بازاڕدا كاڵا دەكڕن و لە چایخانەكاندا گفتوگۆ دەكەن، هەست بە نامۆیی دەكات لە نێویان و لەم ژیانە.

– چۆن دەتوانن ڕووداوەكان لە یاد بكەن یا خۆیان لێی گێل بكەن؟

ئەوكات تاوانەكەش وەك خۆ گێلكردنێكی ئاوا بەسەرماندا تێپەڕی. بەبێدەنگی و بەبێ ناڕەزایی، بەبێ ئەوەی كەس هاوارێك بكات و ئەو خەڵكە ئاگەدار بكاتەوە كە ئێستا تاوانەكە ڕوو دەدات. تەنانەت قوربانییان خۆشیان هاواریان نەكرد، چونكە ترس دەنگیانی نووساندبوو.

تاوانەكە بەبێدەنگی تێپەڕی، بێدەنگییەكەش هانی جەلادەكانی دا كە زیاتر بەردەوام بن و تاوانەكە لە شوێنێكی دیكە و لەسەر قوربانییانی دیكەش دووبارە بكەنەوە.

بیست ساڵ لە نێوان ئێمە و تاوانەكەدایە، چونكە ئەو منداڵانەی لە ڕۆژانی تاوانەكەدا ژیان ئێستا گەیشتوونەتە تەمەنی لاویەتی، لەوانەیە ژنیشیان هێنابێت و منداڵەكانیشیان گەورە بووبن و لەگەڵ ڕەوتی ژیاندا گونجابن. ژیانیش بە فرتوفێڵەكانیەوە دەتوانێت كارەساتەكە لە یادەوەریی خەڵكەكەی بیر بەرێتەوە. بەڵام بزربوو، هەر بەبزربوویی دەمێنێتەوە وەك پرسیارێكی بێ وەڵام. چونكە ئەگەر گۆڕی نەبێت واتا نەمردووە، زیندووش نییە چونكە دەنگی نییە تا ڕووداوەكەمان بۆ بگێڕێتەوە. دەبێت ئێمە هاوبەشی حاجی حەسەن بكەین لە هەندێك لەو پرسیارە بەردەوامانەی: لە كوێن؟ چییان بەسەر هات؟

پێویستە لەسەرمان لە یادمان بێت و وەبیر بهێنینەوە، یادكردن نەك بۆ

خەفەت خواردن یا هاوبەشی خەم، بەڵکو پێشبینیکردنی ئەوەی کە ڕوو دەدات، چونکە ئەو گەلەی لە یاد دەکات کارەسات بەسەریدا دووبارە دەبێتەوە، یادکردنەوە لە جەوهەریدا بۆ گێڕانەوەی چیرۆکێك نییە بەوردەکارییە ناخۆشەکانیەوە، بەڵکو ڕووتاندنەوەی ڕووداوەکە و گۆڕینی بۆ پەندێکە.

تاوانبار کەسێك نییە، چونکە ئەوەی بەسەرشۆڕی و دەنگ کزی لە ناو قەفەسدا وەستاوە بەرهەمی ڕژێمێکە جەلاد لە خەڵکێکی ئاسایی دروستی دەکات. ئەم کەسە یا بە لە سێدارەدان یا بەنەخۆشی شەکەرە دەمرێت. بەڵام ئەو ڕژێمەی بەو توندڕەوییە دروستی کردووە ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەگەری دووبارەبوونەوەی هەیە لەگەڵ ئەو، یا بەبێ ئەو. ئەم ڕۆژانەی ئێستاشمان دووپاتی ئەم پێشبینییە ڕەشە دەکاتەوە.

چونکە لە ڕۆژانی دادگاییکردنەکە یا پێش ئەوسا یا دوای ئەوساش هێشتا هەواڵەکان پێمان دەڵێن کە گۆڕێکی بەکۆمەڵی نوێ لە کەلاوەیەك یا ماڵێك یا کێڵگەیەکدا دۆزرایەوە، هێشتا خەڵکانێك هەن لە ماڵەکەی خۆیاندا یا لەسەر شەقامەکان یا لەسەر کێڵگەکانیان دەرفێنرێن و بۆ یەکجارەکی لە ژیاندا بزر دەبن. هێشتا خەڵك لە سووچ و قوژبنەکاندا تەرمی نەناسراو دەدۆزنەوە کە پێش کوشتنیان ئەشکەنجە دراون.

تاوانەکە وەك بۆی دەچووین ئاوها بەسانایی تێپەڕ نەبوو، ئەنفالیش نەبووە ڕابردوویەکی دوور، بەڵکو ئەنفال لە نێوانماندایە و لەوانەیە گوللەکانیشی بەدەرگەی ماڵەکانمانەوە بنرێت.

دەبێت یادی بکەینەوە و بەبیری منداڵەکانمانی بهێنینەوە، بۆ ئەوەی بەچەسپاوی لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا بووەستن و نەهێڵن بەبێدەنگی تاوان تێپەڕێت، وەك چۆن ئەنفال تێپەڕی.

زوهێر جەزائیری

## بۆ ئەم کتێبە؟

زۆر لەمێژە حەزم دەکرد منیش وەك نووسەرێکی کورد هەڵوێستێکم هەبێت لە ئاست تاوانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە. بەڵام باشترین گەواهی ئەوەیە خەڵکێکی بێگانە باست بکات، نەك خۆت. بۆیە، دوای گەڕانێکی زۆر بۆ ماوەی چەند ساڵێك، ئەم دوو لێکۆڵینەوەیەی نووسەری بەناوبانگی عەرەبی زوهێر جەزائیری کەوتە بەر دیدەم، کاتێك خوێندمەوە، بینیم ئەو لە ئێمە چاکتر لە کارەساتەکانی کورد تێ گەیشتووە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە باکڕاوندێکی وردی پێش ڕوودانی ئەو دوو کارەساتەیە، تێبینییەکی بەسوود و ڕەخنەئامێزی دوای پرۆسەی ئازادیشە.

زوهێر جەزائیری زۆر بەوردی باسی ئەو ڕووداو و هۆکارانە دەکات کە باری ئەمنی و سیاسیی کوردی گەیاندە ئەنفال و کیمیاباران و جینۆساید. هاوکات ئەمە دەنگێکی گەورەی عەرەبییە، داکۆکی لە مافی گەلەکەمان دەکات. بۆیە دەڵێم چاکتر وایە ئێمەی کورد خەڵك باسمان بکات، نەك خۆمان.

وەرگێڕ

بەبێ ئاوڕدانەوە بۆ ڕووداوەکانی پێشوو، ناتوانین ئەنفال بەتاوانێکی دژ بەمرۆڤایەتی بژمێرین، چونکە ئەم تاوانە بۆ ئەوە کرا، ببێت بەتەواوکەری ڕەوتی توندڕەوی و هزری توندڕەویەتی.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا جەخت دەکەمە سەر ئەو ڕەوتە، کە ئەنفال دوایییەکەی بوو. ناگەڕێمەوە بۆ سەرەتای توندڕەوی لە عێراق و ڕووداوەکانی توندڕەویەتی لە سەرەتای چوونی ڕژێمی بەعس بۆ سەر دەسەڵات... بەڵکو لە چەند ساڵێك پێش کارەساتی ئەنفال، بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سالآنی جەنگی نێوان عێراق و ئێران دەست پێ دەکەم.

جەنگ دژی ئێران و ئەو جەنگەی دوای ئەوە، ڕوویەك بوو لە ڕووەکانی سەرکوتکردنی ناوەوەی عێراق: جەنگ دژی ناوەوە. کەواتە جەنگ دژی دەرەوە ڕووپۆشێك و هەنجەتێك بوو بۆ جەنگێکی دیکە دژی ناوەوە. یەکێك لە ڕووەکانی جەنگ، وەلآمدانەوەی پرسی دیموکراتیەت بوو، بارێکی هەستەوەر و ئاڵۆز لە ناوەوەی عێراق.. بەعس بەهاوپەیمانی لەگەڵ هێزێکی سیاسی بۆ لێدانی هێزێکی دیکە تەنیا، شەڕە ناوخۆیییەکانی بەشێنەیی و یەك لە دوای یەك دەکرد، بەلآم ئەمجارەیان هەموو شەڕە ناوخۆیییەکانی پێکڕا دەکرد: هەڵمەتێکی بنبڕکردن و دەرکردنی ئەو کوردانەی کە لە چیاکانی نێوان تورکیا و ئێراندا دەستیان کردووەتەوە بەچالاکی چەکداری... هەڵمەتێکی بەرفراوان بۆ دەستگیرکردن و لە سێدارەدانی شیوعییەکان دوای هەڵوەشاندنەوەی هاوپەیمانیەتییەکی لاواز لە نێوان هەردوو حزبەکە... هەڵمەتێك دژی شیعەکان لەگەڵ

ڕێهێوانەکەی (مرد الراس) ساڵی ١٩٨٧. لەگەڵ هەڵمەتێکی دی بۆ پاکتاوکردن لە ناو بەعسییەکان، بەتایبەتی دوای وەرگرتنی سەدام دەسەڵاتی حیزبەکەی و حکوومەتەکە لە ئەحمەد حەسەن بەکر... بۆیە لە واتا گەورەکانی جەنگەکە، ئەوە بوو، وەڵامدانەوە بوو بۆ هەموو ئەو هێزانەی کە دەیانڕوانییە شۆڕشی ئێرانی وەك هیوایەك بۆ ڕووخانی دەوڵەتی موخابەراتی و دەوڵەتی تاك حزبی.

بەدرێژایی ئەو هەشت ساڵە، جەنگی نێوان عێراق و ئێران بوو بەقوتابخانەیەکی گەورە بۆ ڕەگ داکوتان و بڵاوکردنەوەی توندڕەوی لەسەر بەرفراوانترین ئاستی کۆمەڵایەتی. پێش جەنگ توندڕەوی تەنیا لە دەست ڕژێم و دامودەزگا حزبی و سەرکوتکەرەکانیدا بوو. خەمی گەورەی ڕژێم ئەوە بوو گەلێکی خاوەن مێژووی سیاسیی کۆن و بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری، ئەزموونە مێژووییەکەی نیوەی دەگەڕێتەوە بۆ خەباتی نهێنی و چەکداری و گەلێك ڕاهاتووە بەچاوی گومانەوە سەیری حکوومەتەکان بکات. خەمی گەورەی ئەوە بوو ئەم گەلە ڕابێنێت و دەستبەسەری بکات. بۆیە لە ڕێی دەزگا حزبییە چەکدارەکانی و دەزگا ئەمنییەکانیەوە هەوڵی دەستبەسەراگرتنی کۆمەڵگەی دەدا. موڵکداریەتی و هەڵگرتنی چەك بۆ هاووڵاتیان و حزبەکانی دیکە قەدەغە بوو. هەروەها ڕژێم ساڵی ١٩٥٧ ڕووداوەکانی (ئەبوتەبرە)ی هەڵقۆستەوە و بۆ ڕۆژێك هاتوچۆی قەدەغە کرد، لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا دەزگا حزبییەکان هەستان بە دەستبەسەراگرتنی چەك لە ناو بەغدا. دەزگای حزبیش لەگەڵ دەزگای ئەمنی بەشداری دەکرد بەچاودێریکردنی گومانلێکراوانێك ڕەنگە هەوڵ بدەن بۆ بەرپاکردنی دژە شۆڕش. بەڵام بەکارهێنانی توندڕەوی تەنیا لە دەسەڵاتی دەزگای ئەمنی بوو، کە هەڵدەستا بەلێکۆڵینەوە لەگەڵ گومانلێکراوان بۆ بەزۆر وەرگرتنی دانپێدانانەکانیان و بە زۆر وایان لێ بکەن هاوکارییان بکەن. لە کاتی جەنگ، توندڕەوی تەنیا کاری دەزگای

ئەمنی و حزبییەکان نەبوو، بەڵکو ڕۆشنبیری توندوتیژی بڵاو کرایەوە بۆ تۆقاندنی تەواوی کۆمەڵگە.........، دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش هەموو کاتی خۆیان بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرد بوو، ئەوەبوو زیاتر لە ٦٠٪ ڕووپەڕی ڕۆژنامە و بەخشی تەلەفزیۆنەکان بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرابوو. بێگومان لە کاتی زنجیرەی (جەنگ - سەرکوتکردن) دوژمن دەبێت بەسنگێك بۆ هەڵواسینی هەموو نەهامەتییەکان بەقەدیدا، ڕاگەیاندنیش هەوڵ دەدات زۆرترین تیر و توانج و تانە و تەشەر کۆ بکاتەوە و بیلکێنێتە دوژمنەوە (مرتزقة خميني، الحشرات الضاره، البغل الهرم، الكلاب، الخنازير المدحورة... هتد) ئەم جۆرە ناو و سیفەتانە زۆر دووبارە دەکرانەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی عەقڵی هاووڵاتیی و سەربازا، بۆ ئەوەی بێجگە لەم جۆرە سیفەتانەی کە ڕژێم دووبارەی دەکاتەوە زیاتر لە دوژمنەکەی نەبینێ و زۆر ڕقی لێ ببێتەوە.

پێویست بەوە ناکات ڕەفتاری ڕاستەقینەی دوژمن بزانێت و ئایا تا چەند مەترسی هەیە بۆ سەرمان، بەڵکو ئەوەندە بەسە ئارەزوو، هەستە سەرکوتکراوەکانی ناوەوە بزانرێت و بدرێتە پاڵ دوژمن... بەم شێوەیە دوژمن تەنیا ئەو شەڕە نییە کە هاووڵاتیی تێیدا سەرکوت کرا و لێی دەترسێت، بەڵکو دوژمن ئەو شەڕەشە کە ئەو هاووڵاتییە لە ناخی خۆیدا هەڵی گرتووە. بۆیە کاتێك کە هەموو دوژمنایەتییەکە دەخاتە سەر خودی دوژمن، خۆی دەخاتە ڕیزی خێرخواز، وا هەست دەکات کە پێویستە لەسەری لەگەڵ شەڕدا بجەنگێت، بەجەنگاندن لەگەڵ خودی دوژمندا و پێویستە مامەڵە لەگەڵ یەك دوژمندا بکرێت، بۆیە ڕاگەیاندنی جەنگی عێراقی هیچ جیاوازییەکی لە نێوان سەربازێکی ئاسایی و فەرماندەیەکدا نەدەکرد، هەموو، بەچاوی (خومەینییەکان، چڵکاوخۆرانی خومەینی، فارسی مەجووس) تەماشا دەکرد و وای پیشان دەدا کە ئەمانە بوونەوەرێکی ڕق لە دڵن و شایانی ژیان نین.

ئەم یاسایە لەسەر کوردیش ئەنجام دەدرێت بەسزادانی هاوولاتییان و جەنگاوەران و ئەوانەی لە شەڕی ناو چیاکان بەشدارییان کردووە، یا ئەوانەی لەگەڵ ئێران پێکەوە بەشداری شەڕیان کردووە دژی ئەو... ئەمانە هەموویان دەبێت وەك (یەك دوژمن) سەیر بکرێن و سزا بدرێن.

توندڕەوی و سووکایەتیی پێ کردن لە بڕگەیەکی وتارێکی سەرۆکی عێراق کۆ دەبێتەوە، کە لە بەرواری ١٨/١١/ ١٩٨١ بۆ ئەو سەربازانەی خوێندەوە کە بەرەو بەرەکانی جەنگ کەوتنە ڕێ: "بەهەموو توانایەکتانەوە لێیان بدەن، بێگومان ئێوەن شمشێری خوا لەسەر زەوی، ئەو ملانەش کە لێی دەدەن و دەیپەڕێنن، ملی فورسە مەجووسییەکانە، نۆکەرانی خومەینی شێت".. لەم بڕگەیەدا هاندانێکی نەخۆشییانە بەدی دەکرێت بۆ کوشتن و ڕاگرتنی کوشتن لە ئاستی ئایندارییدا، چونکە بکوژان شمشێری خوان لەسەر ڕووی زەوی.. ئەم زبری و توندوتیژییە لە زۆربەی وتارەکانی سەرۆکی عێراقیدا بەدی دەکرا لە کاتی بەڕێکردنی دەستەی تازە لە سەربازان بەرەو جەنگ، یا لە کاتی بەسینەداکردنی نیشانەی ئازایەتی بۆ جەنگاوەران. لە بەرواری ١٤/٥/١٩٨٤ تەلەفزیۆن سەدامی پێشان دا بەوپەڕی خۆشییەوە لە دڵەوە پێ دەکەنی، ئەویش لە کاتی بەسینەداکردنی نیشانەی ئازایەتی بۆ چەند جەنگاوەرێکی کەرتی ڕۆژهەلاتی میسان: "ئێوە واتان کرد قەلەڕەش و باز و چەقەڵ و کەمتیار و ماسی، تەنانەت کیسەڵیش گۆشتەکانیان بخۆن و پارچە پارچەیان بکەن، وابزانم تا ئێستاش هەندێك لە تەرمەکانیان بەسەر ئاوی هۆرەوە ماوەتەوە".. دووبارەکردنەوەی ئەم وشانە لە وتارەکاندا بەتەریبی لەگەڵ توند و دڕندەیی شەڕە ڕاستەقینەکانی ڕۆژهەلاتی بەسرە بەڕێوە دەچوو.

پێش بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە ڕۆژهەلاتی میسان، بەکۆمەڵێك جەنگاوەری گوت: "برژێنەرەکانیان بۆ ئامادە بکەن!" لە دواییدا بۆیان ڕوون بووەوە، کە مەبەستی لە برژێنەرەکان، غازی خەردەل و دەمارە، کە

بۆ یەکەم جار لە هەردوو کەرتی باکوور و ناوەڕاست لە شەڕدا ساڵی ١٩٨٣ بەکار هات... هەروەها لە ناوەڕاستی حوزەیرانی ١٩٨٤ لە کاتی بەخشینی نیشانەی ئازایەتی بەکۆمەڵێکی دی لە ئەفسەران، گوتی: "ئەوەی پێویست دەکات بەیەك بۆمب سەری بپرشێنن، ئێوە بە دە بۆمب سەری بپرشێنن، ئەوەندە تەقەمەنیمان هەیە کە دەتوانین ئێرانی پێ نوقم بکەین".

لە هەموو ئەو وتارانەیدا باسی مل و جەستە و سەری پرشێندراو دەکرێت، نەك بوونەوەری مرۆڤ، کە دوژمنی بەرامبەرە لە جەنگدا، کاتێکیش سەرۆکی عێراق باسی کوشتن دەکات حەز دەکات باسی ملی پەڕیو بکات، نەك جەنگاوەر و ئەرکی شەڕکردنیان... ئەم جۆرە توندڕەوی و سادییەتە بەشێوەی جەم جەمێکی ڕۆژانە لە وتارەکانی سەرۆکی عێراقییەوە لە ڕێگەی میدیاکانەوە دەگەیشتە هاوولاتی، لە مانشێتی ڕۆژنامەکانەوە دەست پێ دەکات "بازەکانمان گڕکۆی ئاگرین دەکەن بەسەر دوژمندا: "ڕۆژنامەی السورة ٢٣ ئاب ١٩٨٢" تەرمەکانیان بەسەر ناوی هۆرەکانەوەیە: "الجمهورية ٥ نیسانی ١٩٨٤" لەگەڵ هەڕەشەی عێراق بەبۆردومانکردنی ئەو شارانە بەمووشەك ترس و تۆقین سەرتاپای ٧ شاری ئێرانی گرتەوە: ئەلف با شویات ١٩٨٤. (دوا بەدوای گەمارۆکەی دوورگەی خەرەجی ئێرانی) شادەمارەکانی دوژمن پچڕێندرا: السورة ٢٢ ك ١٩٨٥/٢. هەروەها پێش پەخشکردنی هەواڵەکانی کاتژمێر ٨. واتا پێش نووستنی منداڵان، تەلەفزیۆنی عێراقی بەرنامەیەکی پێشکێش دەکرد لە ژێر ناونیشانی (صور من المعركة- چەند وێنەیەك لە بەرەکانی جەنگەوە) تایبەت کرابوو بۆ دەربڕینی کاریگەری جەنگەکە بەسەر زیانەکانی لایەنی ئێرانی. نووسەر دوو هەڵقەی لەم بەرنامەیە بینی لەو ڕۆژانەی کە ئاساییبوون و هیچ شەڕ و کوشتاری سەختی تێدا نەبوو، ئەویش لە بەرواری هەفتەی یەکەمی ئابی ١٩٨٣ بوو: کامێرای

وێنەگرەکە بەسەر ڕیزەکانی تەرمەکاندا دەجوولا و هەر جارەی گرتەیەکی نزیکی پیشان دەداین لە دەموچاوێکی سووتاو، یا دەستێکی بڕاو، یا تەرمێك نیوەی لە ژێر خۆڵدایە... بەهەرحاڵ بەهێمنی دەجوولایەوە بۆ ئەوەی زۆرترین بینەر ورد و درشت وێنەکان ئەزبەر بکات، لە پشت وێنەکانیشەوە دەنگی بێژەرەکە بوو، لەسەرخۆ و بەهەڕەشەوە لەگەڵ زرمەی گرتەکاندا دەیگوت: "ئەمە کۆتاییە... ئەمەیە وەلامی عێراقییەکان... گوتمان و وریامان کردنەوە..." بەشە فارسییەکەی ئەم فلیمانە، جەنگێکی دەروونییە دژی ئێرانییەکان، لە شێوەی فیلمە دیکۆمێنتەکەی نازییەکان سەبارەت بەبۆردومانکردنی وارشۆ، کە هیتلەر ویستی ئینگلیزی پێ هۆشیار بکاتەوە پێش بۆردومانکردنی لەندەن، بەلام بەشە عەرەبییەکەی فیلمەکە وەك جەمێکی ڕۆژانە دەدرایە هاوولاتی عێراقی، دەبا بەتێپەڕبوونی کات ڕابێت لەسەری و قەبووڵی بکات وەك بەشێك لە دیکۆراتی جەنگ، یا ڕەنگە هەر ئاوێتەی ببێت.

توندوتیژی هاتە نێو دەقی ئەدەبیشەوە بەشێوەیەکی زۆر کە پێشتر عێراق بەخۆیەوەی نەدیتبوو، ناویان لێی نا (ئەدەبی قادسیە). توندوتیژی کرۆکی دەقە نووسراوەکان بوو چ ئەوانەی لە ناو بەرەکانی جەنگەوە دەنووسرانەوە یا لە دەرەوەی. ئەم وەلامدانەوەیە بۆ توندوتیژی پشتی بەستووە بەکولتوور و بەردەوامییەکی مێژوویی... چونکە پێوەندییەکی مێژوویی هەیە لە نێوان ڕۆشنبیری عێراقی و توندوتیژی، لە ولاتێك ڕۆژێك بۆی نەبووە ژیانێکی شارستانی و پێشکەوتوو بژێت و ململانێیەکانی بەئاشتیخوازانە بەڕێوە بەرێت. کێشکردن لە نێوان هێزەکانی و هاوولاتی و حکوومەتی دەسەلاتداردا، ئاستی توندوتیژی خوێناوی وەرگرت. ڕۆشنبیریش لەو نێوانەدا بکەر و کارلێکراو بوو، لە بەرهەمەکانیدا مەیلی وێنەگرتنی توندوتیژی دەکرد وەك بابەتێکی ژیاو و هەست پێ کراو، لەگەڵ دڵەڕاوکێی ڕۆحیدا دەگونجێت. بۆ نموونە

چامەکانی جەواهیری کاتێك لە توندوتیژی نزیك دەبنەوە دەگاتە ترۆپکی گەشیەتی (تاریکییەك دایگرت، لێ گەڕێ با ئەم خوێنە بەنرخە برژێت) هەروەها چامەکانی مزەفەر ئەلنواب و بەرهەمەکانی هونەرمەند جەواد سەلیم (دارە بۆمبەکە و ئەسپە بریندارەکە) هەروەها ئەشکەنجەدانی زیندان لە گرینگترین بابەتی ڕۆماننووسەکانە. لەو بەرهەمانەی جەنگدا، وێنەی دوژمنێکی ڕاستەقینەم نەدۆزییەوە، لە هەڵبەستە کلاسیکییەکانی سەردەمی جەنگ دژی ئێران، یا پەخشانە چیرۆکییەکاندا هیچ وێنەیەکی ئاشکرای دوژمنەکەم نەبینی، لە چیرۆکی عادل عەبدولجەبار "چیای بەفرین چیای ئاگرین" هەموو وەسفە ناقۆلاکانی دوژمنم تێیدا دۆزییەوە "دووپشك، ڕسك، کورەکانی سەگ" بەڵام شێوە نادەمیزادییەکەی دوژمنم نەبینییەوە. هەندێك جاریش چیرۆکنووس پەنا بۆ هەمان دەستەواژەکانی ڕاگەیاندن دەبات "بەکرێگیراوانی خومەینی". ئەگەر ویستیشی بچێتە ناو وەسفی دوژمنەکەوە، ئەوا تەنیا باسی بەشی براو لە جەستەی دوژمن دەکات، وەك: دەست، سك، پێ، پشت، سنگ... وەك چیرۆکەکەی وارد بەدر سالم "چەند فەسڵێك لە گەشتی شەو". تەنیا وەسفێك لە چیرۆکی «تەرمەکە»ی هیشام ئەلرکابی بینیمەوە، وێنەی تەرمەکە بوو، کە ڕاوچییەکان لە ڕووبارەکە دەریان هێنا، لە سەرەتا وەك تەرمێکی نەنگ و نادیار دێتە بەرچاو، بەڵام لەگەڵ دۆزینەوەی کەسایەتییەکەی ناکارەکانیشی بەدیار دەکەوێت، سەربازی ئێرانی، کە چەند بۆگەن بێت زیاتر کەلاك و ئاژەڵەکانی مردن لە دەوری کۆ دەبنەوە.

عەقڵی ناتەواو، توندوتیژی بەیەکێك لە ڕووە ڕەسەنەکان دەژمارد، سەرۆکی عێراقی ناوی لێی نا "صولات العراقیین" هەروەها ڕاپۆرتی کۆنگرەی نۆیەمی قوتری بەقوتابخانەی جەنگی ئەخلاقی لە قەڵەم دا، کە هاوولاتییەکی سەربازیی دروست کرد بەسیفەتی تازەوە "خۆشەویستی بۆ سەربازیەتی، پۆشاکی عەسکەری بووە بابەتێکی خۆهەڵکێشان و شانازی

لە لای گەنجان. یاری سەربازی لە هەموو یارییەکانی دی خۆشەویستترە لە لای منداڵ. زمانی سەربازی بەشێوەیەکی بەرفراوان لە ناو کۆمەڵگەدا بڵاو بووەتەوە" بۆیە توندوتیژی لەگەڵ دوژمندا ئاساییە ببێتە کردارێکی کۆمەڵگەیەکی سبارتی عەسکەرتاری، ڕاگەیاندنیش هەوڵی دا کە ئەم خەسڵەتە لە مێژووی عێراقی کۆن ڕەسەن بکات. ئاساییشە توندوتیژی ببێتە بەشێك لە ڕەفتارەکانی گەلێك، مێژووی ژیانی لە نێوان هێرشبردن و هێرشبردندا بردووەتە سەر و لەسەر خاکەکەی چەندین ئیمبراتۆرییەت لەناو براوە. ماوەی ٧٥٠ ساڵە ئەم گەلە ژیانی شارستانی بەردەوامی بەخۆیەوە نەبینیوە. لەگەڵ شەڕەکانیشدا هەر سەرکوت کراوە، کەچی ڕاگەیاندن هۆیەکانی پشتگوێ خستووە و کردوویەتی بەباشەیەك ڕەگی لە مێژووی کۆنی عێراقدا هەبێت، گۆڤاری "ئەلف با" چەند دەقێکی سۆمەری و بابلی بڵاو کردەوە لە ژێر ناونیشانی "لە یادەوەرییەکانی مێژووەوە" هەڵبژێردراوە بۆ بەرچاوخستنی«صولات العراقیین»ی کۆنەکان. هەڵقەیەك لەو زنجیرەیە وەرگێڕانی دەقێکی مەلیك سەنحاریبی ئاشورییە: "وەك مەڕ سەریانم بڕی، بەیەکجاری ملیانم وەك پەتێك بڕی. لە مەیدانی جەنگدا ناوسکی سەربازەکان و سەرەکانیان تێکەڵی خۆڵەکە بووبوون، تەنانەت سمی ئەسپەکەم لە جۆگەلەی خوێندا نوقم دەبوو" لەم جۆرە دەقە لە کەلەپووری میللەتانی تریشدا هەیە، بەڵام ڕاگەیاندنی عێراقی وای پێشان دەدات، کە ئەمە ڕەفتارێکی عێراقی تەواوە، بۆیە لەگەڵ دەقە ئاشوورییەکە، بێژەرەکە دەڵێت: "لەم دەقەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە عێراق عێراقی ئەمڕۆ و داهاتووە. ئەوەی بیەوێ دەستی بۆ ببات، وانەیەکی دەداتێ قەت لە یادی نەکات".




چەند سەختی شەڕەکە و خۆ ئامادەکردنی دەروونی بۆی زیاتر بێت، دڵەڕاوکێی کۆمەڵگە زیاتر دەبێت، تەنانەت لە دوو ساڵی کۆتاییدا گەیشتە ترۆپکی[۱] لە شەڕە گەورەکان «زنجیرە شەڕەکانی ڕەمەزان» لە لایەنی



ئێرانییەوە، (توکلنا علی اللە) لە لایەنی عێراقەوە. هاوکات شەڕ لە مەیدانەکانییەوە بەهۆی مووشەکی دوورهاوێژەوە گەیشتە ناو شارەکان... لەگەڵ توند و سەختبوونی شەڕەکان لە بەرەکانەوە، ڕژێم هەستا بەڕێکخستنەوەی دەزگا ئەمنییەکانی، ئەوەی لە بەرچاو بوو دەسەڵاتی

سەرۆکی عێراقی لەسەر چوار دەزگای سەرەکی چەقی بەستبوو، کە ئیشی موخابەرات و جاسووسی و تیرۆر و سەرکوتکردن و پێش ئەوانەیش پاسەوانی سەرۆکی عێراقیی دەکرد:

١- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ئیستخباراتی عەسکەری.

٢- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی موخابەراتی مەدەنی و عەسکەری.

٣- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ئەمن.

٤- دەزگای ئەمنی تایبەت.

دەبوایە جۆرێك لە دابەشکردنی کار هەبێت لە نێوان ئەم دەزگایانەدا بۆ ئەوەی کارەکانیان تێکەڵ نەبێت. ئەرکی ئیستخباراتی عەسکەری ئەوەیە زانیاری کۆ بکاتەوە دەربارەی وڵاتە دژەکان وەك: ئیسرایل و سوریا و ئێران بۆ ئاشکراکردنی نیازی دوژمنداریەتییان پێش وەختە بۆ ئاگەدار کردنەوە. بەڵام کارەکەی تەنیا کۆکردنەوەی زانیاری نییە، بەڵکو لایەنێکی هێرشبردنی تێدایە، ئەویش دانانی پلانە بۆ جەنگی دەروونی و جێبەجێکردنی فێڵ. هەروەها سەرپەرشتی ئەو کەسانە دەکات کە کارەکانیان پێوەندیی بەسەربازییەوە هەیە. لە سەرەتای هەشتاکاندا سەرپەرشتیی جێبەجێکردنی چەند کارێکی تیرۆری دژی ئێران و سووریا و ڕێکخراوی ئازادیی فەلەستینی و کەسایەتییە عێراقییە بەرهەڵستەکان لە دەرەوەی وڵات کرد. بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی گشتی سەر بەوەزارەتی ناوخۆیە.. کە دەبوایە ئەرکەکەی پاراستنی ئاسایشی ناوەخۆ بێت، بەچاودێری چالاکی ڕۆژانەی خەڵك لە ڕێی ژمارەیەکی زۆری هەواڵدەر کە چاودێری هەڵسوکەوتی خەڵکیان دەکرد. هەروەها کاری سیاسی و چالاکیی ئابووری و قوتابخانەکان و تەنانەت پێوەندییە تایبەتییەکانی نێوان خەڵك.

لە کاتی جەنگ، ئەرکی پاسەوانی کۆماری تەنیا ئەوە نەبوو

پاسەوانێتی کۆشك، ڕێگەکانی و ئێزگە و تەلەفزیۆن بکات. بەڵکو زۆربەی یەکەکانی گواستنەوەی هێڵی دواوەی جەنگ. هێزەکانی فراوان بووەوە بۆ فەیلەق و تەنیا لەسەر ناوچە خێڵەکییەکانی تکریت و دەورووبەری نەمایەوە. بەڵام بەهەرحاڵ فەرمانەکانی تەنیا لە کۆشکی کۆماری وەردەگرت نەك وەزارەتی بەرگری. بۆیە لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا دەزگای ئەمنی عەسکەری دروست بوو بەناوی (ئەمنی تایبەت) بە سەرۆکایەتیی زاوای سەرۆکی عێراقی «حوسێن کامیل». بەشی هونەری ئەم دەزگایە بەجۆرەها ئامێری پێشکەوتوو بەهێز کرا وەك: تیشکی ئێکس و غاما و ئەندامانی مەشق پێ کران کە خەڵکی تکریت و بێجی و شەرگات بوون. لەگەڵ زیاد بوونی دامودەزگای ئەمن و پاسەوانی، لیژنەی ئەمنی تایبەت لە کۆتاییی هەشتاکان دامەزرێندرا، بۆ هەماهەنگیکردن لە نێوان ئەو هەموو دەزگای موخابەراتی تایبەت بەئەمنی ناوەوە و دەستنیشانکردنی ئەرکەکانی سەبارەت بەئەمنی نەتەوەیی و سەرپەرشتی چالاکییەکانیان.

هەماهەنگیکردن لە نێوان دەزگاکان لە ڕواڵەتدا وەك ئەرکی هەر لێژنەیەك وایە لە سەرووی هەموو دەزگاکانەوە بێت.. بەڵام لە وڵاتێکدا کە هەر چالاکییەکی بەرهەڵستی ناوەکی یا ڕەخنەیی بەتەواوکەری چالاکییەکی دەرەکی دژ بژمێردرێت، ئەوا ئەرکەکە تێکەڵ دەبێت و ئەرکی دەزگاکان ئاڵۆز دەبێت و زەحمەتە هێڵی جیاکەرەوەی کاری هەردوو بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ئەمن و ئیستخباراتی عەسکەری دیاری بکرێت. چونکە ئەگەر چالاکیی بەرهەڵستکاری شیعەکان، یا چالاکیی چەکداری کوردی دژی ڕژێمی مەرکەزی لە هۆ ناوەکییەکان جیا بکرێتەوە و بخرێتە سەر هۆ دەرەکییەکان، بەپێی ئەوەی کە بەشێکە لە پیلانێکی ئێرانی دژ بەعێراق، ئەو کاتە دۆزەکانی ئەمنی ناوەکی دەبێتە ئەرکی ئیستخباراتی عەسکەری، کە پسپۆری چالاکییە دەرەکییەکانە. بۆیە ئیستخباراتی عەسکەری بنکەیەکی فراوان و زۆری لە «موخبر» هەیە بۆ گرتنی هەر

چالاکییەکی ناوەکی لە باشوور و ناوەڕاست و ڕەنگە تاقە هێزی ئەمنی سەرەکی بێت لە باکوور. هەروەها لەبەرئەوەی هەموو خەڵك دەبێت عەسکەری بکات، بۆیە چاودێری خەڵك دەبێتە ئەرکێکی ئیستخباراتی و ئەمنی... چاودێریکردنی مامەڵەکردنی کاڵاکان لە بازاڕ دەبێت ئەرکی کەرتی ئەمنی ئابووری بێت، بەڵام دەستبەسەر داگرتنی کاڵای ڕۆژانە، ڕەنگە بەشێك بێت لە پیلانێکی دەرەکی، بۆیە دەبێت موخابەراتی مەدەنی بەشێك لە ئەرکەکانی هەردوو دەزگای عەسکەری و مەدەنی وەرگرێت، هەرچەندە جیاکردنەوەی سنووری کارەکەی لەگەڵ ئەو دووانە کارێکی زەحمەتە. دیارە ئەم پێکداچوونی کارانە لە نێو دەزگاکاندا کارێکی نەخشە بۆ کێشراوە و دانراوە. چونکە دەزگای ئەمنی تایبەت کە(سەبعاوی ئیبراهیم حەسەن) زڕبرای سەدام سەرۆکایەتی دەکات، بەرپرسە لەسەر ناوەوە، بەڵام دەزگایەکی هاوشێوەی هەیە سەر بەوەزارەتی ناوەخۆیە، (وەتبان) زڕبرایەکی دیکەی سەدامە سەرۆکایەتیی دەکات، هیچی لەوی دی کەمتر نییە. ئامانجی ئەم تێکەڵبوونی کارە بۆ ئەوەیە کەسیان دەسەڵاتیان بەسەر ئەوی دیکەیاندا زیاتر نەبێت و هەردەم ململانێیەکی زانیاری هەبێت لە نێوانیان هەر دەزگایەکیش ببێت بەڕەقیب بەسەر ئەوانی تردا، بۆ ئەوەی هەریەك هەست بکات کە چاوی ئەوانی دی بەسەرەوەیە لە هەرەمی موخابەراتیدا. هەریەکەیان لە هەمان کاتدا ترساون و ترسێنەرن، ئەم ترسەش لە کۆتاییدا دەبێت بەموزایەدەیەك بۆ پێشکێشکردنی زانیاری و بەکارهێنانی توندوتیژی بەسەر ئەوانەی لەو کەمترن.

عەقڵی ئەمنی پێویستی بەوە نییە بزانێت ئایا ڕاستە هێزێك هەیە دەیەوێت کودەتا بەسەر دەسەڵاتی دەوڵەتدا بکات؟ چونکە بیردۆزی ئەمنی حزبێك کە جۆش درابێت لەسەر پیلان و کودەتا، پێوەستە بەگریمانی پێشترەوە بۆ نیازی پیلانی ئەندام و کۆمەڵە ناڕازییەکان یا زیانمەندەکان

تەنانەت لە ناو حزبەکەی خۆشی، ئەم کۆمەڵانەش پێیان دەوترێت (ئامادەباشی دژە شۆڕش) وشەی ئامادەباشی واتا هەبوونی نیاز یا توانای پیلان، بەڵام هێشتا جێبەجێ نەکراوە. چاوەڕێی ساتێکی گونجاون. لە پشت ئەم کەمتەرخەمی ئەمنییەوە میراتێکی بیردۆزی هەیە بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکان پێشکێش دەکەن، ئەویش ئەوەیە، کە هەموو قۆناغێکی نوێی شۆڕش دەیبرێت، دەبێتە هۆی پەیدابوونی توێژێکی زیان پێکەوتووی کۆمەڵگە، تەنانەت لە ناو حزبەکەش، کە دەبێتە هۆی پیلانگێڕانی بۆ لەناوبردنی لە هەرکاتێکدا بێت. بۆیە بەعس بەردەوام چاودێری جووڵانەوەی حزبەکانی دی دەکرد و چاودێری سەرهەڵدانی هەر ڕەخنەیەکی ناوەکی دەکرد بەدڵەڕاوکێیەکی توندەوە. کارەکە تەنانەت هاووڵاتیانی ئاسایشی گرتەوە. چونکە لەگەڵ گۆڕانی دەزگاکان، گۆڕانکاری بەسەر چاودێریکردنی ئەمنیشدا هات، کە بەسەر خەڵکەوە دەکرا لە سۆنگەی (هەڵمەتی خستنە چوارچێوەی کۆمەڵگاوە) ئامانجی بەرچاوی ئەم هەڵمەتە ئامارکردنی دانیشتوان بوو بۆ ساڵی ١٩٨٧ لەگەڵیشی یاسای نیشتەجێبوون دەرکرا و جێبەجێش کرا. دەبوایە بەگوێرەی ئەم یاسایە هەر گۆڕانکارییەك لە جێی و شوێنی خێزانێك هەبوایە یەکسەر بەبنکەی پۆلیس بوترێت، وەك مردن و لە دایکبوون و جێ گۆڕین و کار گۆڕین و هاتنی میوانێك و مانەوەی بۆ زیاتر لە مانگێك. ئەم یاسایە کۆپی هەمان شێوازی سۆفیاتییە بۆ خستنە چوارچێوەی کۆمەڵگەوە لە ژێر چاودێری دەوڵەتدا. لەو کاتەدا ڕێکخراوە حزبی و میللی و دەزگا ئەمنییەکان بەسەر هاووڵاتییاندا دابەش دەکرد و سەرپەرشتیی پڕکردنەوەیان دەکرد... لێرەدا هەندێك پرسیار هەیە پێوەندی بەباری کار و بژێوییەوە هەیە، زیاتر ئامانجی هەڵمەتەکە دەسەلمێنێت (باشکردنی بژێوی ژیانی هاووڵاتیان) بەڵام ڕێژەی ٧٠٪ی پرسیارەکان لەسەر باری ئێستای هاووڵاتییەکە و ڕابردووی سیاسییەتی، تەنانەت تا پلە چواری

خزمەکانیشی دەپرسی. لە ناو هەر تێبینییەکیش هەڕەشەکردن هەیە بۆ هەر کەسێك کە زانیارییەك بشارێتەوە، یا زانیاری هەڵە بدات. دەبوایە هەر شەش مانگ جارێك ئەم کردارە دووبارە بکرایەوە.. لەو کاتەی کە بێدەنگی خۆی لە خۆیدا جۆرە مانگرتنێك بوو، پڕۆژەی کودەتایەك بوو، ڕژێمی دەسەڵات دەیویست بەهاووڵاتی بڵێت، کە چەند ئەملاو ئەولا بکات لە دەستی قوتار نابێت، چونکە لە ژێر چاودێریی توندی دەسەڵاتدایە بە هەموو وردەکاری ژیانیەوە. لە پێش هەموویانەوە هزرە سیاسییەکانی و پرسینی هەواڵ لە خەڵك (لە دراوسێ و خزمەکانی تا پلەی چوارەم) ویستی وا لە هاووڵاتیی بکات هەست بکات چاوی لەسەرە و وای لێ بکات لە ژێر گوشاری هەڕەشەدا زانیاریی ئەمنی پێشکێش بکات و بەرە بەرە ببێت بە(موخبیر) بەبێ مووچە لە ژێر دروشمی (لە کۆمەڵگەیەك ئەگەر هەر کەسێك نەبێت بەپۆلیس بەسەر ئەوانی دیکەوە، پێویستی بەپۆلیسێك دەبێت ببێت بە ڕەقیب بەسەر هەموانەوە: وەزارەتی ناوەخۆ)... کۆکردنەوەی زانیاریی تەنیا ئامانجی ئەم تۆڕە بەرفراوانە نەبوو، بەڵکو پێش هەموو شتێك چاندنی ڕۆحی شك و ترس لە نێو خەڵکدا بەشێوەیەك کەس متمانەی بەبرا و دراوسێی خۆی نەبێت، نەبادا وشەیەکی گازاندە لە دەمی دەربچێت و بگەیەندرێتە لایەنی بەرپرسی ئەمنی. ئەم جۆرە تۆقاندنە بەربڵاو و گشتگیرە داهێزرانێکی کۆمەڵایەتیی پلە یەکی دروست کرد. لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییانەی دەزگا سەرکوتکارانە چەندیەتی و جۆر و سروشتی سەرکوتکردنیش گۆڕا، بڕیارەکانی لە سێدارەدان لە نهێنییەوە بوو بەکارێکی ئاشکرا و لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە بڵاو دەکرایەوە. چەند یاسایەکی دیکەش لە «مجلیس قیادة الثورة» دەرچوو، خرایە سەر ئەوانی دیکەوە:

- بڕیاری ٨٤٠ لە ١٩٨٦/١١/١٤ (بەندکردنی تاهەتایی، یا لە سێدارەدان بۆ هەر کەسێك جوێن بەسەرۆکی دەوڵەت یا جێگرەکەی یا

مەجلیس قیادە سەورە یا حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی یا مەجلیس وەتەنی یا حکوومەت بدات.

- بڕیاری ٩٦٠ (ئەنجامدانی تاوان دژی بەرژەوەندی گشتی).

- ٢٩ کانوونی دووەمی ١٩٦٨: لە سێدارەدانی هەر کەسێك پاسەپۆرتێك تەزویر بکات لە دەوڵەتێکی دیکەوە دەرچوو بێت یا هەر بروانامەیەك لە دەوڵەتێکی دیکەوە دەرچوو بێت بۆ بەدەستهێنانی سوودی ماددی، زیان بەئابووری بگەیەنێت.

هەروەها دووپاتکردنی چەند بڕیارێکی کۆنی دی کرایەوە، پێوەستە بە لە سێدارەدانی هەر کەسێك کە: لە عێراق دەرچووە و نەگەڕاوەتەوە- پێوەندی بە حزبێکی دژەوە کردووە- داوای پەنابەری سیاسیی کردووە- چەکی دژی ڕژێم هەڵگرتووە- مامەڵەی لەگەڵ دەوڵەتێکی دوژمندا کردووە- ئامێرێکی چاپی هەبێت بەبێ پرسی دەوڵەتەوە- ڕازەکانی دەوڵەت ئاشکرا بکات.

ژمارەی ئەو بابەتانەی بڕیاری لە سێدارەدان دەیگرێتەوە (٢٥٠) بابەتن، بەشێوەیەکی خاو هۆنرابوونەوە بۆ ئەوەی بەهەوەسی خۆیان دەستکاری بکەن، بۆ ئەوەی هەموو جۆرە ڕەفتارێکی مرۆڤایەتی بگرێتەوە... تەنیا تێهەڕبوونی هاووڵاتیی بە پێش وێنەیەك لە وێنە زۆر و بۆرەکانی سەرۆك بەس بوو بۆ ئەوەی بەنارەزایی لە قەڵەم بدرێت و بەئیهانەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ سەرۆك بژمێردرێت. یا لێکدانەوەی وشەی (جگەرە گرانە) بەهەڵکردن بەرامبەر حکوومەت. دەتوانرێت بڕگەی تایبەت بەمامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەتێکی بێگانە لەسەر کورد و شیعە و بەرهەڵستکاران و دەرکراوان، ئەوانەی ماوەیەك لە سوریا ژیان، لەسەریان ئەنجام بدرێت.

بۆ زیاتر فراوانکردنی ئەگەری مردن و هاووڵاتی بخرێتە باری

بەردەوام بەرگریکردن دژی مردن. برگەی (١)ی ماددەی ٤٢ لە دەستوور لێکدرایەوە بەشێوەیەك دەسەڵات بە(سەرۆك) سەدام دەدات بەهەوسی خۆی بڕیاری یاسایی و گۆڕانکاری لە یاسای سزاکان بکات بەبێ بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەی فەرمی. بەگوێرەی بڵاوکراوەی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانی لێژنەی فەڕەنسی بۆ هەماهەنگی لەگەڵ گەلی عێراقدا، ڕژێم لە ئەیلوولی ١٩٨٤ چەند پرۆسەیەکی لە سێدارەدانی بەکۆمەڵی لە ناوچەی (بسمایا)ی باکووری بەغدا ئەنجام داوە. لە نزیك سەلمان پاك، ژمارەیان «٥» هەزار بەندکراوی سیاسیی بوون هەموو جارێك «٥٠٠» کەس و لە گۆڕستانی بەکۆمەڵ نێژراون. لە ڕۆژی لەدایکبوونی سەرۆك ٢٨ نیسان ١٩٨٦. بە «٨٠٠» بەندکراوی سیاسی لە بەشی سزا قورسەکان گوترا کە بڕیارێك لە سەرۆکەوە دەرچووە بڕیاری لە سێدارەدانتان لەسەر هەڵگیرا وەك «مەکرومە» لە سەرۆکەوە بەم بۆنەیەوە، ئەوانیش لە خۆشیی گەڕانەوەی ژیان بۆیان هەڵهەڵەیان لێ دەدا و گۆرانییان دەگوت، بەلۆری بردنیان، بەڵام سەیر لەوەدا بوو کاتێك خۆیان لە ناو مەیدانی لە سێدارەدان دۆزییەوە لە بەسمایا، لەوێ کۆمەڵ بەکۆمەڵ حوکمی کوشتن لەسەریان ئەنجام دەدرا. ئیتر ئەم قەسابخانە بوو بەنەریتێکی ڕۆژانی جەژنە و بۆنەکان، بۆ نموونە لە شەوی گۆڕانی ساڵ لە ١٩٨٦-١٩٨٧، «٧٠٠» بەندکراوی سلێمانی و بەغدا و باقووبە لە سێدارەدران کە زۆربەیان لە ژێر تەمەنی یاساییدا بوون.

پاش ئەوەی کە مردن لە مەیدانی جەنگ و مەیدانی لە سێدارەدان بوو بەکارێکی ئاسایی،بەم لە سێدارەدانە بەکۆمەڵانە، ڕژێم ویستی شەقامی عێراقی بتۆقێنێت.

لە ڕاستیدا، دەبێت هەموو ئەندامێکی بەعسی بەم تاوانە بەرفراوانەی لە زیندانەکاندا دەکرێت بزانێت. بەڵام کۆمەڵگەی نەهێنیی و ڕاز، کە دروستکراوی تۆقاندن و ئیرهابە، تەنیا قسەکردن لەسەر ئەم تاوانانە –

ئەوەك ئیدانەکردنی- بەتەپڕەشییەکی گەورە دەزانێت.

بۆیە تاکە نهێنی کە ئەستەمە باسی لێوە بکرێت، ئەم تاوانانەیە کە دەزگا ئەمنییەکان ئەنجامی دەدەن... لەبەرئەوەی ئاڵوگۆڕکردنی نهێنییەکان لە نێوان تاکێك و یەکێکی دیکەدا لەسەر متمانە پێکردن بوو بەبەرامبەرەکە، بۆیە ئەو گومانەی کە دەسەڵات بڵاوی کردبووەوە لە ڕێی دەزگا نهێنییەکەی، ئەم ڕاستییانەی کردبووە تەنیا مۆتەکەیەکی ناوەخۆ. لە ژێر گوشاری تۆقاندنێکی سەرتاسەری، کادیری حزبی و عەسکەریش بچووکترین پرسیاری سەر زمانی نەدەکرد لە ئاست ئەو هەموو ڕێنوێنییانەی وەری دەگرت.

چۆن شیوعییەکان بەم شێوەیەن و هێشتا شەڕێکی مەیدانی جەنگن؟ ئەی چۆن بارزانی و کوڕەکانی بەبەکرێگیراو وەسف دەکرێن لە کاتێکدا مێژووی جەنگ لەگەڵیاندا مێژوویەکی دانووستاندنە (برایانەیە)؟

ئەی چۆن شیعەکان بەوە وەسف دەکەن، کە تایفەگەریەتییان زاڵترە لە نیشتمان پەروەریەتی، کەچی ٦٠٪ی سوپای دژی ئێران پێك دەهێنن؟

ئەی چۆن هاوڕێیانی دوێنێ لە نێوان شەو و ڕۆژێکدا بوون بەکودەتاچی و بەکرێگیراو؟

ئەندامی بەعسی نابێت ئەم جۆرە پرسیارانە بکات، چونکە سیستمی ناوەوەی حزب سەقفێکی بۆ گفتوگۆکردن داناوە لەو کێشانە تێپەڕ نابێت کە لە ئاستی لێژنەکەیەتی، تا ساڵی ١٩٨٨ ئەندامێکی بەعسی دەیتوانی خۆی لە بەرپرسیاریەتی جێبەجێکردنی تاوانە جەستەییەکانی ئەم دەزگایانە قوتار بکات، بەپێی ئەوەی کە ئەرکەکەی عەقیدەیییە، ئەگەر چەکیش بۆ بەرگری لە حزبەکەی هەڵبگرێت ئەوا بەسیفەتێکی عەقیدەیی هەڵی دەگرێت وەك چەکدارێك بۆ پاسەوانی عەقیدەکەی، خەبەردانی لەسەر کەسانێك یا جموجۆڵێك هەر لە ڕێگەی دەزگای حزبییەوە بوو، چەند

بەربەستێك لە ترس و ناڕەزاییەکی بێدەنگ لە دەزگا ئەمنییەکان و موخابەراتی تایبەت بەئەشکەنجەدانی جەستەیی و لە سێدارەدان جیای دەکردەوە، تا ساڵی ۱۹۷۹ بەعسییەکان پەنایان بۆ بێدەنگی دەبرد کاتێك پرسیار دەکران سەبارەت بەو تاوانانەی کە دەزگاکانی ئەمن و موخابەرات ئەنجامیان دەدا، بەڵام سەرۆکی عێراقی لە ۱۹۸۵/٥/۲۲ ئەم قەدەغەیەی هەڵگرت، لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ سەرکردایەتیی لقی مەئموونی حزب:

"بەخانەوادەکانیان بڵێن: فلانمان لە سێدارە دا، پرسیار لە باوك و دایك و برا و خوشکەکانی بکەن: ئایا کوڕەکەتان خەریکی ڕاوکردنی تەیر و توور بوو، یا سەر بەحزبێکی دژ بوو؟ پێیان بڵێن: هەموو یاساکانمان دەڵێن: سەری پەل بدەن! کاتێك کە دەڵێن: سەری پەل بدەن، پێویستە گازاندەمان لێ نەکەن ئەگەر کوڕەکەیان خۆش دەوێت"... لێرەوە دەبوایە بەعسی داکۆکی لە مومارەسەکردنی لە سێدارەدان بکات لە پێش ماڵی کوژراوەکە، پاش ئەوەی کە پەنای بۆ بێدەنگی و ڕەتکردنەوە دەبرد. لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا مەودایەك لە نێوان قسە و کرداردا هەیە. چونکە ئەرکی بەعسی لێرەدا ئەوەیە پاساوێکی عەقائیدی بۆ کردارێك بێنێتەوە کە یەکێکی دی ئەنجامی دەدات، بریتییە لە چەند دەزگایەك جۆش دراون بۆ ئەشکەنجەدان و کوشتن، جیا کراونەتەوە لە بەعس بەبەربەستێکی بیرۆقراتی و گریمانی.

بەڵام بەپێی بڕیاری ژمارە ۷۰۰ لە ۱۹۸۸/۸/۲۷ ئەم بەربەستەی نێوان جێبەجێکردن و پاساوی عەقائیدی نەما. چونکە بەندی ژمارە (۱) لەم بڕیارە دەڵێت: "بڕیاری لە سێدارەدان لە لایەن ڕێکخراوی حزبییەوە ئەنجام دەدرێت، پاش دڵنیابوون لە ڕووداوی ڕاکردن یا بەجێمان لە خزمەتی عەسکەری، بەبێ گوێدان بەژمارە و ماوەی ڕاکردنەکەی". لە هەمان نووسراودا، برگەی سێ فەرمانی هەمان سزا بەسەر هەر عزو

فرقـەیـەك یـا بـەرپـرسێکـی ئـەمـنـی دەدات، ئـەگـەر هـاتـوو چـاوپۆشی لـە کردارێکی ڕاکردن کردبێت. ئەم بڕیارە سەرۆکی عێراقی خۆی واژووی کردووە بەسیفەتی سەرۆکی مەجلیسی قیادەی سەورە. بۆ زۆرەملێکردنی بەعسییەکان بۆ بڕیاردان و جێبەجێکردن، داد و جێبەجێکردنیان پێکەوە جووت کرد، هەردووکیشیان لە دەزگا عەقیدەیییەکە. ئەمەش بۆ ئەوەی سیفەتێکی خەباتکاری بدەنە کرداری کوشتن و ئەشکەنجەدان، بەدانانی وەك پێوەرێك بۆ دڵسۆزی حزبی، بەم شێوەیە بەعسییەکانیان تووشی خراپترین تاوانەکانی ڕژێم کرد بۆ بڕینی هەنگاوی گەڕانەوەی، تەواوی بـەر پـرسیـاریـەتـی بـکـەوێـتـە سەرشانـی و هـیـچـی بـۆ نـەمێنێتـەوە تـەنـیـا بەرگریکردن نەبێت لە ڕژێم تا دوا فیشەك.

لە دان پێدانانێکی تۆمارکراو -لە لای نووسەرە- شایەدێك دەڵێت کە مـامۆستـاکـەی کـەفێری بـیـرکـاریـیـانـی دەکرد بـەعسییـەکـی هێمن بووە و پێشتر هیچ دەربارەی شەیدایی و و بەرگریکردنی لە لایەنە خوێناوییەکان نـەزانراوە، لـە کـۆتـاییدا نـاچـار بـوو بـەپێی پلـەی حزبییـەکـەی چوار جار بـــەشداری لـــە گـولـلـــە هـــاوێشتن بـکـات لـە چـەنـد فـیـرارێك حـوکـمـی لـە سێدارەدانــیـــان دەرهـــەق دەرچـــوو بـــوو، یـــەکـێك لـــەو جـــارانـــە لـــە پـــێش قوتابییەکانی لە حەوشی قوتابخانەکە جێبەجێی کرد.

# ڕاکردن لە دوزەخی جەنگ

لە ساڵانی دواییی جەنگدا، ڕاکردن لە خزمەتی عەسکەری، سەرەڕای حوکمی لە سێدارەدان، گەورەترین دیاردەی نارەزاییی بوو بۆ ڕەتکردنەوەی جەنگ. لە کاتی ڕاکردنە درێژخایەنەکاندا، ڕاکردووان فێری جۆرەها ڕێگە بوون بۆ پاراستنی خۆیان، وەك تەزویرکردنی بەڵگەنامە و مۆڵەتەکان، دەربازبوون لە دەستی مەفرەزەکانی عەسکەری، لە هەندێك گەڕەکە هەژارەکان، ڕاکردووان جۆرە سیستمێکی ئێشکگرتنیان دانا بوو بۆ وریاکردنەوەی خێرا، لە کاتی گەیشتنی مەفرەزەکانی تەجنید بۆ ئەو ناوچانە. هەروەها لە گوندەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراقدا، ڕاکردووان چەکەکانیان دەپاراست بۆ بەرگریکردن لە خۆیان لە کاتی هاتنی مەفرەزەکانی تەجنید و سزادان، تەنانەت هێرشیان دەبردە سەر بنکە سەربازییە بچووکەکان، یا ئۆتۆمبێلی سەربازی بۆ پەیداکردنی چەك. بەڵام لە کوردستان بوون بەپشتوێنێکی یەدەك بۆ پێشمەرگە و ئەو چەکدارانەی کاروباری گوندەکانیان بەڕێوە دەبرد.

ڕاکردووەکان لە هەڵوێستێکی سیاسییەوە دژی ڕژێم دەستیان پێ نەکرد، یا نەیانویست ببن بەپاڵەوانی سیاسی، بەڵکو تەنیا مەبەستیان ئەوە بوو ساتەکانی مردنیان دوا بخەن بۆ ڕۆژێك خۆر لە ئاسۆوە هەڵبێت... چونکە ڕۆیشتن بۆ مەیدانی جەنگ نیمچە مردنێکی مسۆگەرە، لێهاتوویی و ئازایەتیی مرۆڤ بەرامبەر بە بۆردومانی ئاسمانی و مووشەکی قورس هیچ کاریگەری و سوودێکی نییە... کەچی ڕاکردن لە جەنگ، دواخستنی مردنە و لەسەر توانای ڕاکردووەکە لە دەربازبوون لە دەستی مەفرەزەکانی تەجنید وەستاوە. سەرەڕای ئەوەی کە ئەمانە دەزانن

ئەگەر بگیرێن لە سێدارە دەدرێن، بەڵام هەر مردنی دووەمیان هەڵبژارد. دەسەڵات هەوڵی دا هاوکێشەکە وەرگێڕێ بەجیاکردنەوەیەکی ئاکاری لە نێوان هەردوو جۆری مردنەکە، هاوکاتی پاداشتکردنی ماددی و مەعنەوی خێزانی کوژراوانی جەنگ پرۆسەی لە سێدارەدانی ڕاکردووان بوو بەنەریتێکی ڕۆژانە... تەنیا لە بەغدا پرۆسەی ڕۆژانەی لە سێدارەدانی ڕاکردووان گەیشت بە ١٠-١٦ پرۆسە... بەم درێژەپێدانەی ڕۆژانە، ڕژێم ویستی درێژە بەسەرکوتکردن بدات لە ڕێی کاتەوە و مۆڵەت نەدات بە لە بیرکردن. ئەم پرۆسەیە بووە نەریتێکی ئاهەنگ ئامێزی یەکگرتوو. بەڵام پێشتر لە سێدارەدان لە ژێرزەمین و ناوچەی دوور لە چاوی خەڵك ئەنجام دەدرا: زیندانی ئەبو غرێب، ناوچەی بەسمایای دوور لە بەغدا، سەربازگەی ڕەشید... بەم شێوەیە ڕووداوەکە تەسك دەکرێتەوە لە نێوان بچووکترین ژمارەی خەڵك. هەندێك جار هەواڵەکەیان لە کەسوکاری دەشاردەوە و لایەنە بەرپرسەکان بەبیانووی نەزانین خۆیان دەرباز دەکرد، ئەوانی تریش دەیانگوت بێ ئاگاین، بۆ ئەوەی خۆیان دوور بخەنەوە لە مەسەلەیەك توانای وەڵامدانەوەیان نییە، تەنیا ئەوەندەیان بەسە کە چاك دەزانن کارەکە ئەنجام دراوە و تەواو بووە، بەم شێوەیە لە سێدارەدان ئامانجی ئەنجامدەرانی دەپێکی بەبێ ئەوەی خۆیانی پێ هەڵکێشن.

بەڵام بەئاشکراکردنی کرداری لەسێدارەدانەکان. ڕژێم ویستی دڵڕەقی خۆی بەکرداری بینراو پیشان بدات و ئەم کردارە بەجۆرێك لە خۆهەڵکێشان پێشکێش بەخەڵکی بکات. بەزۆر پێشاندانی ئەم کارە بەخەڵك، ویستیان دڵنیا بن لە کاریگەری سزاکە بەسەر هەستی بینەرانەوە. سزاکەش تەنیا بۆ کەسی تاوانبار نەبوو، بەڵکو بۆ بینەرانیش بوو. بۆ ئەوەی دڵنیا بن ئەگەر هاتوو خۆشیان یا منداڵەکانیان هەمان تاوان بکەن، ئەوا هەمان ئەنجامیان بەسەردا دێت. بەعس حزبێکی

سیاسییە و رژێمێك لە ڕۆژان دژی دەسەڵات بووە. بۆیە چاك دەزانێت پرۆسەی لە سێدارەدان ڕەنگە كاریگەری پێچەوانەشی هەبێت بەسەر بینەرانەوە و هەردوو هەستی ئیعجاب و بەزەیی كۆ بكاتەوە. بەتایبەتی ئەگەر هاتوو لە سێدارەدراوەكە چاونەترس و خاوەن هەڵوێستێكی توند بوو. لە سەرەتای پرۆسەكان هەندێك لە ڕاكردووەكان پێش ئەوەی گوللەباران بكرێن دروشمی دژی سەدام و جەنگیان دەوتەوە. بۆیە سیستمی بەستنەوەی دەمیان پەیڕەو كرد بۆ ئەوەی نەهێڵن داكۆكی لە خۆی بكات و هەڵوێست بنوێنێت. ئەنجامدەران هەموو سیفەتێكی سیاسییان لە پرۆسەی ڕاكردنی سەربازەكان لە جەنگ شاردەوە بەوەی كە پارچە تەختەیەكیان دەكردە ملی لە سێدارەدراوەكەوە لێی نووسرابوو (جبان) واتە بێ غیرەت، وەك بڵێی ئەمە سیفەتێكی خراپی خودی ئەو كەسەیە، نەك كردارێكی سیاسی. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك لە بەزەیی لە دڵی ئەو كەسانەی بۆ هۆشیاركردنەوە و بەشداریكردن لە ڕەتكردنەوەی (تاوانی) ڕاكردن دەمێنێتەوە و هەستیش دەكرێت بەدڕندانەیی ڕووداوەكە و لە ناخیاندا گوللەهاوێژەكان بە تاوانبار دێتە بەرچاویان، هەروەها لەوانەیە گوللەهاوێژە تازەكان هەست بەناشیرینی كردارەكەیان بكەن، بۆیە هەندێك لە ئافرەتی بەعسی لە ئەندامانی یەكێتیی ئافرەتان بەشداری لە پرۆسەكە دەكات بۆ ئەوەی لە كاتی ئەنجامدانی هەڵهەلە لێ بدەن بۆ ئەوەی ورەی ئەنجامدەران بەرز بكەنەوە و ڕواڵەتێكی خەباتكارانەش بەپرۆسەكە ببەخشن. هاوكات هەمان ئەو هەڵهەلانە نووزە و لاوانەوەی دایك و خوشكانی كوژراوەكان دادەپۆشێت. ڕژێم بەبەشداریكردنی (مونەزەمە بەعسییەكان) بۆ بڕیاردان و جێبەجێكردنی لە سێدارەكان ڕانەوەستا، بەڵكو بەشداریی بەخێزانی كوژراوەكان كرد لەو تاوانانە و بەزۆر ٢٥ دینار پارەی ئەو گوللانەی نراوەتە سنگی كوڕەكانیانەوە لێیان وەردەگیرا... لە زیارەتێكی بۆ گوندی ئەلبوكریدە لە هۆر، سەرۆكی عێراقی

بوو بەمیوانی جووتیارێك ناوی (عناد) بوو، ئەم مەكرومەیەش هۆی خۆی هەیە، هەروەك لە لێداونێكیدا بۆ تەلەفزیۆن ئاشكرای كرد.. چونكە ئەم باوكە عەریزەیەكی بەدەسەلآت دا بەتایبەتی بۆ سەدام داوای لە سێدارەدانی كوڕێكی خۆی كرد، چونكە ئەم كوڕەی بەتەنیا لە نێو براكانی لە جەنگ ڕای كردووە. بۆیە بەفەرمانێكی سەرۆك ئەم چیرۆكە بوو بەفلیمێكی سینەمایی.

لە شوباتدا ڕۆژنامەی سەورە لاپەڕەیەكی تەرخان كرد بۆ وێنەی پێشوازیی سەرۆك بۆ پیرێكی ٧٧ ساڵان بەناوی (هاشم محەمەد عەلی حوسێن) و بەخشینی یەكێك لە بەرزترین نیشانەی دەوڵەت بەم پیرە. ئازایەتیی ئەم كابرایە لەوەدا بوو، كە بەدەستی خۆی و بەدەمانچەكەی خۆی كوڕەكەی خۆی كوشت، چونكە سوور بوو لەسەر ئەوەی نەچێتەوە بۆ بەرەكانی جەنگ پاش گەڕانەوەی لە یەكێك لە مۆڵەتەكانی. هەروەها لەگەڵ نیشانەكە پارەیەكی زۆر، دوو خانوو و سەیارەیەكی لیمۆزین و دەمانچەیەكی خەلآتی تایبەتی، سەدام پێشكێشی كرد.

بەم دەرهێنانە ئاهەنگ ئامێزی تاوانی باوكەكە، سەرۆك ویستی تاوانی پرۆسەی كوشتنەكە بەهادار و بەدەرخات، وەك پاڵەوانیەتییەكی میللی و دابونەریتی عەشایەری و دێهاتی زیندوو بكاتەوە، بەوەی كە دەبێت باوكە پاكەكە بەدەستی خۆی و بەگوللە، شەرم و بێ غیرەت لە مێژووی خانەوادەكەی نەهێڵێت. بەم شێوەیە پایەی باوكەكە گەڕایەوە پاش ئەوەی بەعس دەیویست لێی وەرگرێتەوە بەكردنی كوڕ "چاوی شۆڕش بێت لەناو خێزانەكەی" و سەرچاوەی ترس و تۆقاندن بێت. ئەمجارەیان تەرتیبی كلاسیكی خێزان بەكار هێنرا بۆ ئەوەی لە سەرەوە ترس لە دەوڵەتەوە بخرێتە ناو خێزانەوە، لەو باوكەوە كە بەرپرسیاریەتی بڕیاری لە سێدارەدانی كوڕەكەی هەڵگرت لەجیاتیی دەوڵەت و سزاكەی وەك دادوەرێك و جەللادێك ئەنجام دا. بەئەنجامدانی لە سێدارەدانی ڕۆژانە

و زەلیلکردنی تاوانبار و بینینی ڕاستەقینە، ڕژێم ویستی کوشتن بگۆڕێت بۆ دیاردەیەکی ناسراو و ڕەها و دوور لە ڕەتکردنەوە. تەنانەت تا رادەیەکیش ڕەزامەندی لەسەر هەبێت. بەڕازیبوونیش لەسەری ڕژێم ویستی تەواو کۆمەڵگە ملکەچ بکات بەوەی گوایە ئەمانە هەمووی کاتین و گوشاری باری شەڕە لەگەڵ دوژمنی دەرەکی.

جەنگی ناوەوە بەهاوتەریبی لەگەڵ جەنگی دەرەوەدا بەڕێوە دەچوو، هەریەکەیان گوڕ و جۆشی دەدایە ئەوی تریان و هاندان و مەشروعیەتی لێی وەردەگرت. ترسناکترین چەکیش لە هەردوو مەیدانەکەدا بەکار هاتبێت، غازی ژەهراوی و غازی ئەعساب و خەردەل بووە... بەڵام ڕژێم لەم دوو ساڵەی دواییی جەنگدا نەیتوانی زاڵ بێت بەسەر ئاڵۆزی و قورسی باری ناوەخۆدا... چونکە لە ساڵانی کۆتایی جەنگدا داهێزرانێکی بەرچاو لە ناو دەزگای عەسکەری ڕوویدا بەهۆی ڕاکێشانی موالیدی ١٩٤٩ تا ١٩٦٨ ئەمەش بووە هۆی تێکچوونی پاکی ئیمان و عەقیدەی سوپا و بوو بەدەزگایەکی پڕ لە گومان، بۆیە چاودێرییەکی ئەمنی بەهێزیان لەسەر سوپا دانا و مانگی سێ جار فۆرمیان بەسەریاندا دابەش دەکرد، ترسناکترین پرسیار لە ناو ئەو فۆرمانەدا ئەوە بوو: باری سیاسیی ئێستا و پێشوو، خزمەکانی تا پلەی چوارەم...

زۆربەی کەرتەکانی سوپا موخابەرات باڵی بەسەریدا کێشا بوو، ئەمنی عەسکەری هاتە جێی موخابەرات. ئەندامانی ئیستخبارات ڕاستەوخۆ پێوەندییان بەبەڕێوەبەرایەتییەوە هەبوو نەك کەرتی سەربازی خۆی. هەردوو بەڕێوەبەرایەتییەکەش ڕاستەوخۆ پێوەندیان بەسکرتێری سەرۆك کۆمارەوە هەبوو بەبێ ئەوەی کارەکان بەکەرتە سەربازییەکانیان تێبەڕێنن. جۆرەها دەزگا چاودێری سوپایان دەکرد: ئەمنی تایبەت، هێزی تەواری، موخابەراتی گشتی، ئەمنی گشتی. ئەمە جگە لە کادیرەکانی حزب کە ڕاپۆرتی خۆیان ڕاستەوخۆ بۆ حزب دەنووسی، لەبەر زۆری ئەم دەزگا

چاودێرانە دەیانگوت "نیوەی سوپا سەرقاڵە بەچاودێری نیوەکەی دیکەوە". بەڵام زۆری گواستنەوەی کەسەکان و کەرتەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی و زۆری تەجنیدکراوی تازە وای کرد ئەم چاودێریکردنە قورس بێت، تا لە بەرە گەرمەکانی پێشەوەی جەنگ نزیکیش بایەیتەوە، ئەو تۆقاندنەیان نەدەما، چونکە سەربازەکان ڕۆژانە لەگەڵ مردندا دەژیان. هەرچی (جەیش ئەلشەعبی)یە، کە وەك چەکداری حزبی لە هاوشانی سوپادا دروست کرا، زیاتر لە سوپا پاکی عەقیدەکەی تێکچوو بوو، چونکە تەجنیدکردن بۆ ئەم کانتۆنە سەربازییە عەقیدەی نەدەکردە پێوەرێك. چونکە ئەو خانە لاوازانەی لە بەرەکاندا پەیدا بوو، وای کرد هەر کەسێك تەمەنی ئاسایی بۆ تەجنید نایگرێتەوە، ڕای کێشن، بۆیە ئەو کەسانەی تەمەنیان لە نێوان ١٧-٦٥ ساڵە هەموویان تەجنید کران، زۆربەی ئەمانەش چەند جاری دیکە تەجنید کرابوون، دوای ئەوەی لە ناو ماڵ و شوێنی کار ڕفێندراون و پەلکێش کراون، بەم کارەش جەیش ئەلشەعبی زیاتر ڕق و قینی دژی دەزگای عەسکەری دروست کرد.

دوای شەڕەکانی مەهران و فاو، بێزاری و ناڕەزایی لە ناو پۆلەکانی سوپا زیادی کرد، بەتایبەتی لە ڕیزی خاوەن پلە و پایە ئەزمووندارەکان. هەروەها چەند دەنگێك بەئاشکرا قسەیان دەکرد و بەرپرسیاریەتی ئەو هەموو زیانە بەشەرییەی لەم جەنگانە کەوتەوە، دەیانخستە ئەستۆی سەرۆکی عێراقی و عەدنان خێروڵڵا و دەست خستنە ڕاستوخۆیەکانیان لە بەڕێوەبردنی جەنگەکان، کە بووە هۆی لەناوچوونی زۆربەی کەرتە نازاکان... هەروەها فەرماندە سەربازییەکان هەستیان بەزیادبوونی ژمارە و دەسەڵاتی حەرەس جمهوری کرد، کە بوو بەهێزێکی هاوتەریب لە ئاستی سوپا... هێزێکی هاوتەریبی دیکە سوپا ناوی (وحدات ئەلعقاب) بوو واتا (کەرتەکانی سزادان) کە دوور بوو لە دەسەڵاتی فەرماندەکانی مەیدانی جەنگ و فەرمانەکانی ڕاستەوخۆ لە کۆشکەوە وەردەگرت، ئەم

کەرتانە کە لە هێڵەکانی دواوەی جەنگ دەوەستا، فەرمانی لە سێدارەدانی بەسەر ئەو سەرباز و فەرماندانەی بەبێ پرسی فەرماندەکانیان لە جەنگ دەشکان و دەگەڕانەوە ئەنجام دەدا. مەترسی ئەم کەرتانە لە زیادبووندا بوو، چونکە ئەمانە ڕاستەوخۆ و پاش ئەوەی بەرپرسیاریەتی زیانەکانیان دەخستە سەر شانی فەرماندەکان، لە بەرچاوی سەربازەکانیان لە سێدارەیان دەدان.

ڕەنگدانەوەی ئەم بێزاریانە لە زیادبوونی ژمارەی هەوڵدانی تیرۆرکردنی سەرۆکی عێراقی، یا کودەتاکردن بەسەریدا لەم دوو ساڵەدا بەدیار کەوت.... زۆربەی ئەم هەوڵانەش لە کاتی سەردانەکانی بۆ بەرەکانی جەنگ ڕووی دا. بۆیە پێشتر سەرباز و فەرماندە پلەدارە ناوڕاستینەکانیان چەك دەکرد پێش هاتنی سەدام، سەرەڕای ئەوەی کە لە بەرەکانی جەنگیشن، هەروەها دەبایە لەسەر زەوی بەزۆر دانیشن و گوێبیستی وتارەکانی سەدام بن، هاوکات وەك شوورێك پاسەوانەکانی ڕووەو سەربازەکان دەوەستان و لوولەی چەکەکانیان ڕووەو سەربازەکان دەوەستاند. ئەم ترس و دڵەڕاوکێیە لەسەر قوتابییەکانی ئامادەیی و زانکۆکانیش ڕەنگی دایەوە، چونکە ڕەنگە لە هەر ساتێکدا ڕایان کێشن، یا بۆ خولێکی مەشقی خێرا، یا ڕاستەوخۆ بۆ ناو جەنگ بۆ پڕکردنەوەی کەلێنە پەیدابووەکان. لە ساڵانی سەرەتای جەنگەکەدا، لەبەر تەجنید کردنی بەربڵاو، گەنجەکان و نەوە نوێیەکان خرانە ژێر گوشاری ئامادەباشییەکی توندەوە. ئەویش ئامادەباشی تاکە حزبەکە و ئامادەباشی عەسکەری بوو. بەڵام باری ڕەتکردنەوەی جەنگ لە نێوان قوتابییانی ناو شار لە بەهاری ١٩٨٢-١٩٨٤ ڕووی دا، بەتایبەتی لە شارە کوردەکان، قوتابییان لە خۆپیشاندانێکدا ڕووبەڕووی هێزەکانی ئەمن و جاشەکان بوونەوە، کەچی قوتابییانی زانکۆکانی ناوەڕاست و باشوور بێ جووڵە بوون. بەڵام لە بەهاری ١٩٨٧ پاش ئەوەی بڕیاری

تەجنیدکردنی هەموو قوتابییانی دواناوەندی و زانکۆکان دەرچوو، خۆپیشاندان لە شارەکانی ناوەڕاست و باشووریش سەری هەڵدا. کە بووە هۆی ئەوەی بۆ یەکەم جار، دەسەڵات بۆ ماوەیەکی کاتی لە بڕیارەکانی خۆی سەبارەت بەتەجنیدکردنی قوتابییەکان پاشگەز بێتەوە. لە ئاستی ئەو تووڕەبوونی بەکۆمەڵە، دەست کرا بەپەیڕەوکردنی سیستمێکی هەستیار لە ڕێگەی گۆڕانکاری لە ڕاگەیاندن بۆ جەنگەکە... لە پێشان مارشی سەربازی و گۆرانی و حەماسەت لەگەڵ بەردەوامبوونی شەڕەکان بەردەوام دەگوترایەوە، بەڵام دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەستیان کرد ئەم ستایلە تووڕەبوونی خەڵك و زیادبوونی هەستەکانیان بۆ گەورەیی کارەساتەکە زیاد دەکات. بۆیە ڕاگەیاندنی عێراقی دوای شەڕە سەختەکانی ڕۆژهەڵاتی بەسرە، ستایلی گواستنەوەی هەواڵی شەڕە گەورەکانی گۆڕی و ستایلی ئیسرایلی بەزمانی عەرەبی بەکار هێنا، کە تەنیا بەیانی وتەبێژی سەربازی دادەگرێت، دووبارە بەرنامەکان بەئاسایی دەست پێ دەکەنەوە. لەم کاتانەدا وەزیری ڕاگەیاندن دەربارەی دەوری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن (کۆمەڵگەی جەنگی دوورودرێژدا) لێدوانێکی دا. ئینجا ڕۆژنامەکان هەستان بەبڵاوکردنەوەی ڕەنگدانەوەی ژیانی ئاسایی وەك چاپخانە و بازاڕەکان، وەك ئەوەی کە جەنگ سەرەڕای گەرمی بەرەکانی لەژیانی ئاسایی خەڵکەوە دوورە، هەروەها خەم و ئازارە گشتییەکانی، کرد بەبارێکی تاك، یا کەم، بەوەی تەرمی کوژراوەکانی بەشێوەی پچڕ پچڕ و تاك تاك دەدایەوە بەهەڵگرتنی لە ناو فرێزەری ساردکەرەوەدا. زۆرجار دانەوەی تەرمەکان لە شوێنی پارێزراو و دوور لە شار دەدرایەوە، وەك ناوچەی (نەبو غرێب). کاتێك کوشتاری شەڕە گەورەکان زیادی کرد، ڕژێم بیانووی (بزربوو)ی دۆزیتەوە.. واتە نە کوژراوە و نە زیندووە و نە دیلە.. بەم دەستەواژەیە ڕژێم ویستی خانەوادەی کوژراوەکان لە ژێر کاریگەریی چاوەڕوانی گەڕانەوەی بزربووەکان

بهێڵێتەوە، توانیشی تا ڕادەیەك ڕزگاری بێت لە پاداشتکردنی خانەوادەی شەهیدەکان.

هەروەها دڵەڕاوکێی ناوەخۆ لە ڕێی وتەیەك خاڵی دەکرایەوە: ئەو سەربازانەی لە هێڵەکانی پێشەوەی ئاگری جەنگ ژیان و چەندەها جار مردنیان بینیوە، لە کاتی مۆڵەتە فەرمییەکانیاندا ئەو خەم و دڵەڕاوکێیەی لە ناخیاندایە لە ڕێی جۆرەها کاری توندوتیژی لە ناو شاردا خاڵی دەکەنەوە، وەك لێخوڕینی خێرا و نائاسایی، شەڕکردن لە بارەکان و تەعەداکردن لە ئافرەت. سەبارەت بەم بارەش جۆرە ڕێنوێنییەکی فەرمی هەبوو، کە ئاسانکاری و نەرمی بنوێنرێت لەگەڵ ئەو سەربازانەی ئەم جۆرە ڕەفتارانە دەنوێنن.

ئەو هاوولاتییانەی کە نەیاندەتوانی ڕووبەڕووی دوژمنی ڕاستەقینەی خۆیان ببنەوە، (دوژمنێکی) لاوازتریان دۆزیتەوە، ئەویش میسرییەکان بوون. بەرپرسیاریەتی ڕۆڵەکانیان لە مەیدانی جەنگ دەخەنە سەرشانی ئەوان و دەبن بەنیشانەیەك بۆ لێدان و کوشتن(٢). بۆیە بڕیارێك لە مەجلیس قیادەی سەورەوە دەرچوو، بۆ گرتنی هەر کەسێك دەمەقاڵێ لەگەڵ هەر میسرییەکدا بکات بۆ ماوەی ٤-٦ مانگ، بەبێ ئەوەی هۆی دەمەقاڵێیەکەش بزانرێت چییە. بەڵام ساڵی ١٩٨٦ بارەکە بە پێچەوانەوە گوڕا و ئەو ڕێز و حورمەتە نەتەوە گەرییەی بەرامبەر بە میسرییەکان دەنرا پێی لە عێراقییەکان جیا دەکرانەوە، نەما. ئەمەش بەهۆی نەتوانینی عێراق پارەی تەحویلاتی میسرییەکان بەدۆلار بداتەوە. بۆیە ئەم جارە موخابەراتی وڵات هەڵدەستێ بەتێکدانی کۆبوونەوەی میسرییەکان لە بەغدا و پارێزگاکانی تر و ڕاگەیاندن ڕاپۆرتی تاوانەکانیانی لە ڕۆژنامەکان بڵاو دەکردەوە سەبارەت بەتەهریب و تریاك فرۆشتن و تەزویرکردنی پارە و بازاڕی ڕەش و بڵاوکردنەوەی فەسادی جنس و کوشتن، کە باندە میسرییەکان پێی هەڵدەستان. بەم واتایەش وەزیری

دەرەوە تاریق عەزیز وتەیەکی بڵاو کردەوە پاش تێکچوونێکی کاتی لە نێوان میسر و عێراق بەبۆنەی حوکمی لەسێدارەدانی چەند میسرییەك لە عێراق. ڕژێم بینی کە لە بەرژەوەندیدایە کرێکارە میسریەکان بکات بەکۆگەیەك بۆ کۆکردنەوەی خراپەکانی خۆی و بەتاڵکردنەوەی دڵەڕاوکێی ناوەوە بە ڕووی ئەواندا. لە پاشاندا تەوژمی ئەم دڕندایەتییە بە ڕووی ئافرەتاندا کرایەوە، لە سۆنگەی چەند وتار بڕیارێك لە بەهای ئافرەتی کرێکار کەم دەکاتەوە و بەرامبەر بەبەهادانی ئافرەتی منداڵدار، کە پێنج منداڵی هەبێت یا زیاتر. لە کۆتاییشدا دەرچوونی بڕیارێك کە گوایە تاوانی شۆردنەوەی حەیا و نامووس بەبێ لێپێچینەوەش، کارێکی یاساییە...

هەموو ئەم یاسایانە بۆ ئەوە بوو شك واسواسی سەربازەکان بەرامبەر خێزانەکانیان زیاد بکات و بەردەوام مشووری ئەوان بن، نەك لۆمە و گازاندەیان بخەنە سەر دەسەڵاتدارانی جەنگەکە. بەڵام ترسی ڕژێم لەوەدا بوو ئەو دڵەڕاوکێیەی ناوەخۆ ببێت بەیاخیبوونێکی میللی، ئەگەر هاتوو شکستێکی عەسکەری لە بەرەی جەنگدا ڕوو بدات. وەك خۆئامادەکردنێك بۆ ئەم گریمانە، ڕژێم خۆی ئامادە کرد بۆ کارێکی بەربڵاوی سەرکوتکارانەی زۆر گەورە، لە سەرووی خەیاڵ و باوەڕپێکردن بێت. ئامانج لەم تاوانە گەورەیە ئەوەیە، هەموو ڕەنگدانەوەیەکی یاسایی یا نێودەوڵەتی پێش وەختە ڕەت بکاتەوە و تەواوی کارەکە بکات بەشتێکی عەبەسی، تاوانی گەورەش بوار بۆ تاوانبار دەڕەخسێنێ، بەهەر بیانوویەك بێت خۆی پشت ئەستوور بکات...

مەشقکردن بۆ ئەم تاوانە گەورەیە، بەبەکارهێنانی غازە ژەهراوییەکان لەسەر زیندانییەکان دەستی پێ کرد. سەرچاوە کوردییەکان دەبێژن، کە ئەو بارزانییانەی لەساڵی ١٩٨٣ لە کۆمەڵگەکانی نیشتەجێبوون ڕفێندران، لە دوایدا بۆ تاقیکردنەوەی چەکی کیمیاوی لەسەریان

بەکارهێنران، دواتریش لەسەر خەڵکانێکی زۆری کوردستان بەکار هێنرا، یەکەم جاریش لەو ناوچانەی دەورووپشتی پێشمەرگە بەکارهێنرا, کە گەیشتنی سوپا بۆ ئەو ناوچانە ئەستەمە، لە ڕۆژانی ١٤،١٥، ١٧ /١٩٨٧ غازەکانی خەردەل و دەمار و ژەهراوییەکان لە لێدانی ناوچەی (کانی تو، سیروان، بالیسان و شێخ وەسانان)ی پارێزگەی هەولێر و چەند ناوچەیەکی دیکەی فراوانی کەرتی بادینان نزیك سنووری تورکیا تاقی کرایەوە، هەموو ئەو هاووڵاتییانەی بۆ چارەسەر هاتنە هەولێر، ژمارەیان (٣٨٥) کەس بوو بە خۆیان و منداڵەکانیانەوە گیران و لە گۆڕی بەکۆمەڵدا زیندەبەچاڵ کران.. هاوکات ناوچەی سەردەشتی ئێران بەچەکی کیمیاوی لێ درا، بەمجۆرە جەنگی دەرەکی و ناوەکی لە کات و ئامرازی بەکارهێنراودا یەکسان بوون[٣] [٤].

# ئەنفال

دوور لە مەزلّووم، کاتێك لە چاوی جەللادەوە دەمڕوانییە تاوانەکە، هەولّم دا بچمە ئەو خەیالّەی کە بۆچی ناوی ئەنفالی بۆ ئەم پرۆسە خوێناوییە هەلّبژارد؟ ئەو سورەتە باس لە شەڕێکی نێوان موسلّمانان و کافرەکان دەکات، کە لە سالّی دووەمی کۆچی و دوای جەنگی بەدر بەمانگێك ڕووی دا. جەخت لەسەر دابەشکردنی دەسکەوتەکانی (ئەنفال) دەکات، ئەو جەنگە ناهاوسەنگەی نێوان ٣١٣ یاوەری پێغەمبەر، کە پاش بڕینی بیابان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ و سێ شەو ماندوو بوون، بەچەکێکی سادەوە. لە بەرامبەریاندا سوپای قوڕەیش لە ٩٥٠ جەنگاوەری پڕ چەك پێکهاتبوو... وێ دەچێ شك کەوتبێتە دلّی یاوەرانەوە سەبارەت بەسەرکەوتنیان لەم شەڕەدا، بەلاّم پێغەمبەر دوای نوێژ و نزایەکی قورس، بەلّێنی سەرکەوتنی پێیان دا، چونکە فریشتەکانی خوا لە تەك یاوەرانی دژی کافرەکان دەجەنگن، ئەم بەلّێنە هاندانێکی مەعنەوی بەموسلّمانانی یەکەم دا و شەڕیان کرد و سەرکەوتن.. بێینەوە سەر ئەنفالەکەی بەعس، نە لە ڕووی هاوسەنگیی ژمارەوە (هێزەکانی حکوومەت بریتیبوون لە ٢٠٠ هەزار لە قوات خاسەی پشت ئەستوور بەزرێپۆش و تانك و فڕۆکە، بەرامبەر بەچەند هەزارێك لە پێشمەرگە بەچەکی سووك و ناوەنجییەوە)، نە لە ڕووی شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەکەوە، کە پرۆسەکە زیاتر بۆ سەر هاوولاّتییانی مەدەنی بوو بەتایبەتی پیر و ئافرەت و مندالّ چوونیەك نەبوون... خودی ڕووداوەکە خۆی لە خەیالّی بکوژدا نەبووە، بەلاّم ئەم سورەتە پڕە لە دەستەواژەی توندوتیژی و مردن: "یساقون الی الموت، یقطع دابر الکافرین، ولو کره المجرمون، سالقي في قلوب الذین کفروا الرعب، فاضربوا فوق الاعناق، واضربوا کل بنان.. شدید العقاب، جهنم وبئس

المصير، فلم تقتلوهم ولكن الله قتلهم، فامطر علينا حجارة من السماء، فذوقوا العذاب بما كنتم تكفرون، الى جهنم يحشرون، واقتلوهم، ليهلك من هلك من بينه، ذوقوا عذاب الحريق..." ئەم دەستەواژانەش لە وتاری ڕژێمدا نوێ نەبوون، چونکە ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ بەیانەکانی جەنگ لەگەڵ ئێراندا، دەبینێت کە وەرچەرخانێك لە دەستەواژەکانی وتاری نەتەوەیی بۆ دەستەواژەکانی وتاری ئایینی هەیە و لە ساڵانی دوای ١٩٨٦ دەستی پێ کردووە، چ لە ناوی شەڕەکان و ناونیشانی بەیانەکان، کە (سورەتی ئەنفال) سەرچاوەی سەرەکی بوو بۆ سەرۆکی عێراقی، کە ناوەکانی لێی هەڵبژێرێت. لە شەڕە کۆنەکان ناونیشانی (مل پەڕاندن)ی هەڵبژارد، کە بووە ناونیشانێکی هاوەڵ بۆ کوشتن.

لە یەکێك لە چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانییەکانیدا، سەرۆکی عێراقی هەڤپەیڤینەکەی گۆڕی بۆ مێژووی ئیسلامی : "باب و باپیرانمان لە سەرەتای پەیامەکەدا ناوهایان دەکرد"(٥)ڕۆژنامە فەرمییەکانیش جۆرەها هونەریان بۆ تەشبیهی (حجاره السجیل) بەبۆردوومانی شارەکان دەدۆزییەوە. هەروەها دۆزەخی خوا و مووشەکەکانی زەوی-زەوی، هێرشی فڕۆکەکان و تەیری ئەبابیل.. ڕژێم جگە لە دەستەواژەکانی توندوتیژی و شەڕانگێزی زیاتر، هیچی دیکەی لە قورئان وەرنەگرتووە، بۆ دۆزینەوەی بۆ شەڕێکی ئایینی بۆ تاوانەکانی. سورەتی ئەنفالیش بەپشت بەستن بە ئایەتی :" اذیوحي ربك الى الملائكة اني معكم فثبتوا الذين امنوا سالقي في قلوب الذين كفروا الرعب فاضربوا فوق الاعناق واضربوا منهم كل بنان" بەکار هێنرا، چونکە ئەم ئایەتە کرداری (اضربوا فوق الاعناق)ی تێدایە، هەروەها ئەو تۆقاندنەی کە کرداری (القاء الرعب في القلوب) دەیکات. ئەنفال وەك ناوێك بۆ یەکێك لە لقەکانی حزبی بەعس لە کوردستان بەکار هات. هەروەها هەمان ناو بۆ کۆمپانیایەکی بەڵێندەری سەر بەحکوومەت بەکار هێنرا، کە هۆرەکانی باشووری وشك کردەوە.

## چۆن پرۆسەی ئەنفال لەسەر کوردستان جێبەجێ کرا؟

کارەکە بەبڕیارێکی سەرکردایەتی دەستی پێ کرد، لە کۆبوونەوەکەی ڕۆژی ۱۹۸۷/۳/۲۹ مەجلیس قیادە سەورە بڕیاری دا، عەلی حەسەن مەجید ببێت بەحاکم و دەسەڵاتداری کوردستان (دەسەڵاتی هەموو دەزگا حکوومی و مەدەنی و عەسکەری و ئەمنییەکانی پێ بدرێت، بەتایبەتی دەسەڵاتەکانی لیژنەی ئاسایشی نەتەوەیی). لە سەردەمی حوکمی بەکردا ئەم دەسەڵاتانە بە سەدام درابوو، دەبێت بدرێت بەعەدنان خەیروڵڵا وەزیری بەرگری. گۆڕانکارییەکە تەنیا لە پایەدا نەبوو، بگرە گۆڕانکاری بوو لە سروشتی دوژمنی نوێ و سروشتی سوپا و دەزگا داپڵۆسێنەرەکان. لە کاتێ کە یەکەکانی سوپا لە بەرەکاندا هێشتا لە ئامادەباشیدا بوون بەرامبەر بەئێران، سێ فەیلەقی عەسکەری و دەیان هەزار (فەوجی خەفیفە)ی کورد لە بەرەکانی جەنگ کێشرانەوە و کرانە هێزی ئاسایشی ناوەخۆ، بەرەو باکوور کەوتنە ڕێ بۆ جەنگێکی فراوان لە کوردستان... هاوکات فرقەیەکی تەواو بەرەو هۆرەکانی باشوور کەوتە ڕێ، بۆ پاککردنەوەی لە سەربازانی هەڵاتوو و ئەو عەشیرەتانەی داڵدەیان دەدەن. هەڵبژاردنی ئامۆزای سەرۆکی عێراق عەلی حەسەن مەجید هەڵبژاردنێك بوو بۆ ئەرکێك و شێوەی جێبەجێکردنەکەی، چونکە ئەمە ژیانی سەربازیی خۆی بەنایب عەریفێك لە هێزی پاسەوانیی کەرکووك دەست پێ کرد، سەرکەوتنی بەپلەکاندا لە ساڵی ۱۹۷۱ دەستی پێ کرد، بەوەی چالاکیی خۆی چەسپاند لە گۆڕینی دیموگرافیای شاری کەرکووك و دەرکردنی کورد و تورکمان لەو شارە.. یەکەم پلەی کە وەری گرت،

مورافقی حەمادی شەهاب تکریتی بوو.. سەرکەوتنی بەپلەکانی حزب و دەزگاکاندا، دوو ڕاستیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: یەکەمیان، پێوەندیی بەو پێکهاتە تایبەتییەوە هەیە کە ڕژێم پشتی پێیان دەبەست. دووەمیان: پێوەندیی بەو گۆڕانکارییەوە هەیە کە لە عەقیدەی ڕژێم پەیدا بوو.. چونکە ئەمە یەکێکە لە تاکەکانی عەشیرەت، کە پێش وەرگرتنی دەسەڵات، هیچ مێژوویەکی حزبی یا سیاسیی نەبووە. هەموو هۆش و پەروەردەیەکیان لە ناو چوارچێوەی دەسەڵاتدا بووە، بەبێ ئەوەی هیچ ئەزموون و لێهاتوویییەکی ئیداری و سیاسییان هەبێت، لە گوندێکی وشکەوە هاوردران بۆ پاسەوانیی دەسەڵات، پاش چەند خولێکی چڕی عەسکەری، خزانە ناو شوێنە هەستیارەکانی دەسەڵاتەوە. کە ئەویش پاسەوانی تایبەتیی فەرماندەکان و کۆشکی کۆماری بوو... ئەگەر باوك و مامەکانیان لە بەعسییەکان کە شۆڕشیان دروست کرد، جەماوەریان لە ڕێگەی ڕۆژانی کاری نهێنی، یا لە ڕێی کۆبوونەوە جەماوەرییەکانی (أنت تسأل والحزب یجیب) واتە (تۆ دەپرسیت و حزب وەڵام دەداتەوە) یا هیچ نەبێت لە ڕێی کاری حزبییان یا ئیدارییان ناسیوە، ئەوا ئەم نەوە نوێیەی پاسەوانان لە ناو کۆبوونەوەی داخراوی خێزانییەوە گەشەیان کردووە، لە ناوچەیەکی نیشتەجێبوونی داخراوی دەوروبەری کۆشکی کۆماری، بازاڕی داخراویان هەیە و شوێنی ڕابواردنی شەوانیان داخراوە.. لەم شوێنە داخراوانەیان بەبێ کاروانی و پاسەوانی بەسەیارەی جام تاریك دەرناچن، ئۆتۆمبێلەکانیان شەقامەکان زۆر بەخێرایی دەبڕن و چەکەکانیان لە پەنجەرەکانەوە هاتووەتە دەرێ و ئامادەیە بۆ لێدانی هەر کەسێك پێشی کاروانەکە بگرێت..کاتێك کاروانەکە نزیك دەبێتەوە بەشێوەیەکی ئاسایی شەقامەکان لە پیادە خاڵی دەبن.. ئەم ژیانە دابڕاوە لە هەموو ئاڵۆزییەکانی حزب و دەوڵەت و بەسەرهاتەکانی خەڵك و ئەو بارە پڕ لە مەترسییەی سەبارەت بەهەڕەشە دژی فەرماندایەتی، وای لێیان

کرد بڕوانـنـە هـەمـوو شتێکی دەرەوەی خۆیـان، وەك شتێکی ترسنـاك و مەزەندەی غەدری لیٚ بکرێت. بەرامبەر بەوەش هەندێك فەرمانی توند بەسەریـانـەوەیـە، کە هـەمـوو کـارە تـایـبـەتـیـیـەکـانـیـان بەنهێنییەکی تەواو ئـەنجام بدەن و کـاری تـایـبـەت و جووڵانـەوەی فـەرمـانـدایـەتی بـەنـهێنی بمێنێتەوە، دەستەی پاسەوانە نزیکەکانیش، تەنیا سەربازی سادە و ساکار نین هـەڵـبـژێردرا بـن بـۆ ئـەرکـی پـاسەوانـیـی فـەرمـانـدەکـان، کـە هـیـچ پـێوەنـدیـیـەك لـە نـێوان هـەردووکیـانـدا نـەبێت، بگرە پێوەندیی خوێن و چارەنووس بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە.

چونکە وا پەروەردە کراون، کە چارەنووسی خۆیان و ماڵ و منداڵیان پـێوەستـە بـەژیـانـی خزمـانـی فـەرمـانـدەوە، هـەر مـەترسییەك دووچـاری فەرماندەکانیان بێت، دووچاری عەشیرەت و خێزانەکانیانیش دەبێتەوە، کـە لـە دووری چـەنـد مـەترێك لـە کـۆشکـەوە دەژیـن.. هـەروەهـا بـەهـۆی سوودمـەنـدیـیـەوە بـەکۆشکەوە بـەندن، چونکـە کـاری پـاسەوانـی هـەموو کـارێکـی بـەڕێوەبـردنـی بـەڵێندەری بـۆ خـۆیـان و خـزمـەکـانـیـان دەستەبەر دەکات، زۆر جار کارەکان عەسکەرییە یا بازرگانییە و قازانجێکی زۆری بۆیان هەیە. هەروەها ئەم شوێن و پێگانە ژیانێکی شەوانەی تایبەتیان بۆ دابین دەکات لە یانەی داخراودا، کە بە شوێنی ئەفسووناوی دەچێت لە نێو گەلێکی برسیی بەر زەبری ئابڵووقەی ئابووری کەوتبێت.

پـاسەوانـی ڕژێم و بـەرژەوەنـدی تـایـبـەتـی، پـێوەستـبـوون بـەتـاوان و لەناوبردنی خوێناوی لە ناو خێزانەکە و دەرەوەی. کاری لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدانیش لە بنکە تایبەتییەکاندا بەشێکی سەرەکییە لە بەرنامەی مەشقکار، لە دەزگای پاسەوانی بەم ڕووحەوە دەروانرێتە دەسەڵات، کە هەلێکە بۆ دەسکەوتنی زۆرترین پارە و سامان و موڵکی تایبەت، لە کەش و بـارێکـی پـڕ هـەست کـردن بـەدژایـەتـی و ڕق و قـیـنـەی بـەرامـبـەر و پێوەستبوونی ڕەگەزایەتی خێزانی داخراو بەتاوانەوە، لەم بارەدا دەسەڵات

بۆ خێزانەکە، بوو بەدۆزی مان و نەمان. پلە و پایە ئەمنییەکانی بەتەواوی لە ڕووی دەوڵەت و حزب داخران، لە دەزگای پاسەوانیی تایبەتیش چەند فەرمانده‌یەکی نوێ بەرز بوونەوە لە حزب و دەوڵەتدا، کە بەتوندوتیژییەکی یەکجار زۆر بەسەر خەڵکەوە ناویانگیان دەرکرد، وەك:حوسێن کامیل، سەدام کامیل و عەلی حەسەن مەجید.

بەدرێژایی سەرکەوتنی بێدەنگ بوو، کەس دەنگی نەدەبیست، نە لە ناو حزب و نە لە ناو دەوڵەت. یەکەم جار لە کۆبوونەوەیەکی حزبی وەك گوتەبێژێك بەدیار کەوت، داوای مردنی دەکرد. لە کاتی دادگاییکردنی ڕەفیق حزبییەکان لە ١٧ی تەمموزی ١٩٧٩ کە پێی گوترا کودەتاکەی محەمەد عایش، بێدەنگی هۆڵەکەی شکاند و ڕووی قسەکانی لە دادوەر سەدام حوسێن کرد: " هەتا عەبدولخالق سامەڕایی لە ژیاندا مابێ کودەتا لە ناو حزب بەردەوام دەبێت" دادوەریش وەڵامی دایەوە: «لەم شواریەی وەرگرە!» سەدام فێر بوو پشتی پێ ببەستێ لەو کارانەی پیاوێکی بێ دڵی دەوێت "فەرماندەی پرۆسەکانی ئەنفال و حاکمی عەسکەریی داگیرکردنی کوێت و سەرپەرشتیاری عەسکەری لەناوبردن و دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی گوندەکانی باشوور بوو".

ئەم پلە نوێیەی کە بۆ ئەرکێکی نوێ بوو، فەرماندەیی چوار فەیلەقی سوپا بوو لە کوردستان، کە ٤٠٪ی هەموو سوپای عێراقی پێك دەهێنا کە ١٠ فەیلەق بوو. ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ قۆناغێکی نوێی سەرکوتکردنی ناوەوە... ئەو نووسراوە فەرمییانەی بەواژۆی ئەون، زۆر بەکورتی ئاماژەیان تێدا هاتووە، چونکە بەهیچ شێوەیەك ڕوونکردنەوە و جیاکردنەوەی تێدا نییە، بەڵام بڕیارەکانی فراوانترین لەناوبردن لە خۆی دەگرێت. هەردوو وشەی (واتا) و (هەموو) لە هەموو بڕیارێکیدا وەك جمك دووبارە دەبێتەوە. چونکە (موخەڕیب) بەپێی بەرنامە لەناوبەرەکەی، تەنیا کەسێك نییە کارێکی دژ بەدەوڵەت کردبێت و بەگوێرەی تاوانەکەی

سزا بدرێت، بەڵکو خۆی و خانەوادەکەی، ئەگەر نەتوانرا دەستگیر بکرێت، ئەوا بەگوێرەی ڕێنوێنیی نهێنیی ژمارە ٤٣٥ دەبێت خانەوادەی موخەڕیبەکە بار بکات، یا کوڕی تریشیان هەبێت لەگەڵ دەسەڵاتدا بجەنگێت. لەسەر ستایلی ئیسرایلیی یەکەکانی ئەندازیاری ماڵی خانەوادەی موخەڕیبەکە دەڕووخێنن و چوار ماڵی تریش لە دەوروبەریان دەبێت بڕووخێندرێن (دەقی نووسراوە فەرمییەکە وا دەڵێت). بەگوێرەی ئەو بڕیارە فەرمییانەی لە ٢٥/٤/١٩٨٧دا دەرچوون، سزاکە گوندی خانەوادەکەش دەگرێتەوە:

– تەختکردنی هەموو ئەو گوندانەی هاوکاریی موخەڕیبەکان دەکەن.

– گوللەبارانکردنی هەر کەسێك کە لە شوێنی قەدەغە دەبینرێت.

– لە هەر گوندێکەوە گوللە دژی هێزەکانمان بتەقێندرێت، دەبێت ئەو گوندە تەخت بکرێت.

– هەر کەسێك شت بداتە (موخەڕیب) لە سێدارە دەدرێت یا دەدرێتە دادگای خێرا.

دووبارە دەگەڕێینەوە ئایەتی دەسپێك لە سورەتی ئەلئەنفال: دوای جەنگی بەدر (ئەلئەنفال: دەسکەوت) بوو بەسەرەباسێکی بگرە و بەردە لە نێو یاراندا، تا یەکەم ئایەتی هاتە خوارەوە، کە دەڵێت: "يسألونك عن الأنفال قل الأنفال لله وللرسول فأتقوا الله وأصلحوا ذات بينكم وأطيعوا الله ورسوله إن كنتم مؤمنين".

ئەی لەم هەڵمەتەی ئێستادا ئەنفال چ واتایەك دەبەخشێت؟ جووتیارانی کورد گوندانی لەناوچووی (ئەنفال) ئۆتۆمبێلی گرانبەها و قاڵبە زێڕیان نەبوو، وەك ئەوانەی کە جەنەراڵ و فەرماندەکان لە شەڕی کوێت دەستیان کەوت. بەڵام یەك شتیان هەبوو، ئەویش (خاك) بوو، هەر ئەو خاکەش، مەبەست و ئامانجی پرۆسەکان بوو.

پرۆسەی چۆڵکردنی ئەو زەوییانە لە دانیشتوانی کوردی، پشتی بەیەك



لە گەرمیاندا، تاشەبەردی سەر کۆڕەکان لە دوورەوە وەك مۆتەکە لە ناو تۆز و خۆڵەکاندا خۆیان بە دەردەخەن

ڕوونکردنەوە بەستبوو: ئەو نەتەوانەی لە وڵاتانی هاوچەرخی عەرەبدا دەژین، پێیان وایە کە ئەو کەمە نەتەوە نامۆیانەی لەگەڵیاندا دەژین، مافی ئەوەیان نییە داوای ئەو خاکە بکەن کە لەسەری دەژین "ئەو خاکەی ئەم نەتەوانە لەسەری دەژین بەشێك بوو لە وڵاتانی عەرەبی، کە هەزاران ساڵە دامەزراوە، کە دوا دەوڵەتیان، دەوڵەتی عەباسیی گەورە بوو. ئەم خاکەش – لە هەمان کاتدا – نشینگەی ئەو نەتەوانە بوو. بۆیە ناسنامەی عەرەبی ئەم خاکە، کە ئەم کەمە نەتەوانە لەسەری دەژین لە ڕێی زەبر و کۆلۆنیال و داگیرکردنەوە نەهاتووە، بەڵکو لە ئەنجامی واقیعێکی مێژوویی دووروودرێژی هەزاران ساڵی پێش ئێستاوە دروست بووە، لەو قۆناغە مێژووییانەشدا هیچ ململانێ و ناکۆکییەك نەبووە" ئەم تێڕوانینە هەموو مافێکی دروستکردنی کیانێکی نەتەوایەتی بۆ ئەم نەتەوانە ڕەت دەکاتەوە، چونکە پێی وا نییە ئەو خاکەی لەسەری دەژین هی ئەوان بێت. ئەم لەناوبردن و بەزۆر توانەوەیە، لەگەڵ جێبەجێکردنی کرداریانەی دەستەواژەکەی حزبی قائیددا یەکیان دەگرتەوە.. چونکە چەق بەستن و مەرکەزییەت کە بووەتە هەوا و هۆگرێکی بەردەوام، لەسەر تواندنەوەی نەتەوەیەکی بچووك لە نێو نەتەوەیەکی گەورە و فەرمانداییەتیی تاکە حزبەکە بۆ نەتەوە گەورەکە و، زاڵبوونی تاکە فەرماندەکە لە سەرووی ئەم هەرەمەوە وەستاوە. کرداری تەسککردنەوەی دەسەڵاتی لە سەر نەهێشتنی هەموو جۆرە فرە حزبی و نەتەوەیی و ئاینێك وەستاوە، ئەمەش بەلێکردنەوەی هەر ئەندامێکی ناقۆڵای نەگونجاوی جەستەیەك دەبێت.. وا باوە کە بەعس ئەم کردارە بەهۆی فەناکردن و دەرکردن لەسەر کورد جێبەجێ دەکات. چونکە لە ساڵی ١٩٧٥دا هەلی دانوستانەکەی لەگەڵ شای ئێراندا قۆستەوە بۆ بەرپاکردنی گەورەترین پرۆسەی لەناو بردن و لەت لەتکردنی کیانی نەتەوەی کورد و بەش بەشکردنی پاش داگیرکردنی سەربازیی گوندە کوردییەکان.

بەقەدەر ئەوەی کە ئیرادەی بەعس دەیویست گەلێك لەسەر پێوەری سەرۆك دروست بکات، ئەوەندەش دەیویست واقیع و ڕووداوەکان بەگوێرەی وێناکردنێکی عەقائیدی پێشوەختە دروست بکات. سەدام بەردەوام قیادەکەی خۆی هۆشدار دەکردەوە لە ترسی ئەوەی (ڕووداوەکان گەمارۆیان بدات و ناچار بن کارێك بکەن پێشتر بڕیاریان بۆی نەدابێت، بەڵکو بارێك یا هێزێکی یاخیبوو ناچاری کردبێت). بۆیە زۆر جار جەخت لەسەر (دەسپێشخەری) دەکاتەوە، کە بەبڕیاردان لێکی دەداتەوە پێش ئەوەی ببێتە پێویستییەك واقیع بیسەپێنێت.

وشەی "توانا" زۆر جار لە وتەکانیدا دووبارە دەبێتەوە. نووسەر لە چەند فەرهەنگێکدا بەدوای واتای حەرفی ئەم وشەیەدا گەڕا، بۆی دەرکەوت کە واتاکەی لە نێوان "هێز بەسەر شتێکدا و زاڵبوون بەسەریدا، توانینی کردنی شتێك یا وازهێنان، ئەو هێزەی کە بەبڕی کار دەپێورێت. لایەنی چەپ و دەوڵەمەندی.. هتد" دەخولێتەوە.

بەشێوەیەکی گشتی توانا سیفەتێکی تاکە، دەدرێتە پاڵ کەسێکی دیاریکراو، بەپێچەوانەی دەسەڵات کە بۆ کۆمەڵێك کەسە... لێرەدا جۆرە تێکەڵاوییەك هەیە. لە نێوان توانا و توندوتیژی، ئەوەی دووەمیان بەئامرازەکانی دەناسرێتەوە کە بەکاری دێنێت بۆ زیادکردنی تواناکەی، تواناش هەرچەندە لە ڕووی کرۆك و جەوهەرەوە بەدوورە و بێلایەنە لەوانی تر، بەڵام بەدیار ناکەوێت تا پێوەندی لەگەڵ شتی تر و کەسانی تردا نەکات.

وشەی (توانا) لە وتارەکانی سەرۆکی عێراقیدا زۆر ئاڵۆزە، لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکانیدا ئەم وشەیە دیار دەکات بە "ئەگەر هێزمان بەتوانا هەڵاوێرد، ئەوا پێوەندییەکە لەگەڵ یاسادا فەراهەم دەبێت" بەڵام لە کۆتاییدا هەر دەگاتە کرداری هێز بۆ دەستەموکردنی واقیعێکی یاخیبوو.

لە هەمبەر "توانا"دا، سەدام بەردەوام وشەی "بار" بەکار دێنێت وەك

ئاماژەیەك بۆ واقیعێك لە ژێر مامەڵەکردندایە. ئەم واقیعەش نە توندە و نە بوونێکی سەربەخۆی هەیە. بەڵکو دروستکراوی هەستە، کاتێك دەبێتە بارێکی مامەڵە لەگەڵ کراو، دەبێت بەنێگەتیڤ و ئامادە دەبێت بۆ پێشوازی بڕیارێك، بۆ ئەوەی بگۆڕێت بۆ بارێکی تر بەگوێرەی ویستی سەرۆکی فەرماندە. بەم شێوەیە "توانا" بەو هێزە ئامادە کراوە دەهێورێت وەك هاوکێشەیەکی پێچەوانە بۆ ڕوویەڕوو بوونەوەی گوشاری واقیعێك بەئامانجی کارتێکردنە سەر ئەو واقیعە.

بەڵام واقیع و خەڵکەکان بوونی خۆیان هەیە، کە بەربەرەکانی لە دژی ئیرادەی گونجاندن یا سڕینەوە دەکات.. چەند گوشاری واقیعی پێچەوانە زیاد بێت بەسەریەوە، زیاتر دەبێت بەدوژمنی یا کودەتایەکی دەرەکی دوژمن. ئەو کات، لەجیاتی ئەوەی لە واقیعەکە تێ بگات و مامەڵەی لەگەڵدا بکات، پێوەندییەکە دەگۆڕێت بۆ شەڕی ئیرادە. ئەمەش بەئاشکرا لە بارە خوێناوییە یەك لە دوای یەکەکانی نێوان سەرکوتییەکانی ناوەوە و جەنگەکانی دەرەوە بەدیار دەکەوێت.

هەردوو شەڕەکە بەوە دەست پێ دەکات، کاتێك لایەنەکەی دی یا بوونی یاسایی لایەنەکەی دی ڕەت دەکرێتەوە.

سەبارەت بەناوەوە، ئەو تاکە حزبەی، کە بووەتە ئیرادە و ویستی تاکەکەسێك، ناتوانێت بوونی هێزێکی تر قەبووڵ بکات. ئەگەر قەبووڵیشی کرد، ئەوا دەبێت بوونی یاسایی خۆی لە (باوەڕ بەڕەوتی شۆڕش) وەربگرێت. ئەم ڕەوتەش زۆر پەنا و پێچ و مەترسیدارە، بەپێی ئەوەی ڕەنگدانەوەی ویستی تاکەکەسێکە شۆڕشەکە بەڕێوە دەبات.

سەرکردایەتیی بەعس، زنجیرەیەك گوشاری یەك لە دوای یەك دەخاتە سەر هێزەکانی تر، بۆ ئەوەی بەهیچ شێوەیەك بەربەرەکانیی نەکات و ئیرادەیەکی ناوەکی بەسەریدا بسەپێنێت. سەرکوتکردنەکەش بەشێوەیەکی تاکەکەسی دەست پێ دەکات، ئەگەر ئەو هێزە یاخی بوو لە ملکەچکردن،

ئەوا هەوڵ دەدات نەیهێڵێت لە دەوروبەری خۆی، بەپەیڕەوکردنی دوو ڕێگەچارەی چەسپاو: بەزۆر بارکردن، یا لەناوبردنی تەواو.. لێرەدا ئیرادە دەبێتە پاساو و عەقیدە بۆ کردار، چونکە سەرکوتکردنی جەستەیی دەست پێ دەکات وەك دەسپێکێك بۆ عەقیدە، لە دواییدا عەقیدە پێویستی بە پاساوهێنانەوە دەبێت. هاوکات لەناوبردنی جەستەیی و ڕەتکردنەوەی عەقیدەیی پێکەوە دەبن. چونکە پرۆگرامە چەسپاوەکان، بە گوێرەی کادیرێکی پێشووی ڕاگەیاندنی بەعس "هاوکاری ڕاگەیاندن و دیبلۆماسییەکان ئامۆژگاری دەکات لە بەندی یەکەمی، بەڕەتکردنەوەی بوونی هەر هێزێك یا ڕەگەزێکی بەرهەڵستکار" ئەگەر زۆر پێویستیش بکات، ئەوا هاونیشتیمانیش لەو هێزانە وەردەگیرێتەوە و بەدەستێکی دەرەکی دەژمێردرێت. ئەگەر بزووتنەوەیەکی شیعی بەرهەڵستکار دژی تایفەگەری ڕژێم پەیدا بێت، بەتەواوکەری پیلانێکی ئێرانی لە لایەن شا، یا خومەینی دەژمێردرێت. هەروەها بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری کوردی دژ بەشۆفێنییەتی دەسەڵات وەك "ڕەگەزێکی چەسپاوی بەکرێ گرتەیی بارزانی و بنەماڵەکەی" مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. تەنانەت هەر ناڕەزاییەك لە ناو بەعس بۆ تاکڕەوی سەرۆك لە ناو حزبەکە، بەپیلانێکی سووریی دژ بەعێراق لە قەڵەم دەدرێت.

ڕژێم هەڵەکانی بزووتنەوەی چەکداری کوردی، کە کاری چەکداری لە ناو کوردستان بەستەوە بەجەنگ لەگەڵ ئێراندا بەشێوەیەك کە یەکەمیان لە هەندێك قۆناغدا بووە هۆی دووەمیان. ڕژێم ئەمەی قۆستەوە. ئەو ڕژێمەی کە ناتوانێت بڕوانێتە هیچ بەرهەڵستییەکی ناوەخۆیی، تەنیا لە ڕوانگەی ئەوەوە نەبێت، گوایە ئەمە تەواوکاری پیلانێکی دەرەکییە، ئەم بۆچوونەی کرد بەپۆشەرێکی عەقیدەیی و پاساوێك بۆ هەڵمەتەکەی خۆی، بۆیە هەڵمەتەکەی بەجەنگی دەرەکی بەستەوە. سەرەڕای گەڕانەوە بۆ خاڵی سفر دوای نیو ملیۆن کوژراو، کەچی ڕژێم هێشتا خۆی بەسەرکەوتوو دانا.

هەنگاوی داهاتووش سەرکەوتن بوو بەسەر کلك و گوێکانی دوژمن لە
ناوەوە، ئەمەشی بەبڕیارێکی مەجلیس قیادە سەورە جێبەجێ کرد لە
١٩٨٧/٤/٢٥ بەناونیشانی (بنبڕکردنی چالاکییەکانی موخەریبین):
دووبارە چۆڵکردنەوەی شریتی سنووری لەگەڵ ئێران و تورکیا و سووریا
بەقوولایی (٣٠) کیلۆمەتر لە هەر زیندەوەرێك تێیدا بژیت. ئەمە بەژمارە
واتا لەناوبردنی زیاتر لە ٤٥٠٠ گوند و شار و شارۆچکە بە ٢٤ قەزاوە
هەروەها نەخشەکە دەڵێت: چۆڵکردنی ناوچە نیشتەجێیەکانی نزیك
ڕێگەوبانە گشتییەکان و تەختکردنی ماڵەکان لەگەڵ زەویدا.
مەجید لە ماوەیەکی کورتدا دەستی بەکار کرد، ئەوە بوو لە ١٠ی نیسانی
کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە بەرپرسانی حزبی و حکوومی
ئەمنی بەست، لە کۆبوونەوەکەدا بڕیاری نەهێشتنی گوندەکان پێیان
ڕاگەیاند و شوێنەکانی بکرێت بەناوچەی قەدەغەکراوی ئەمنی. ئەم
نەخشەیە بەدوو قۆناغ ئەنجام درا:

یەکەمیان لە ٢١/٤ دەستی پێ کرا و لە ٢١/٥ کۆتایی هات.

دووەمیان لە ٢١/٥/ دەستی پێ کرا و لە ٢١/٦ کۆتایی هات.

لە سێ مانگی یەکەمی دەسبەکاربوونی، کۆمەڵێك دەسکەوتی (بەرچاوی)
بەدەست هێنا، لە نەهێشتنی ژیان لە قوولایی عێراقدا، لە دۆڵەکانی
هەولێر و قەراج و مەخموور و کەرکووك، تەنانەت گوندەکانی دەوروبەری
شاری مووسڵ و کەنارەکانی دیجلە، کە بەناوەڕاستی عێراقدا تێپەڕ دەبێت
لەناوبردنەکە تەنیا ئەو گوندانەی کە پشتگیری شۆڕشی کوردی دەکرد
نەگرتەوە، بەڵکو ناوچەی عەشیرەتە لایەنگرەکانی حکوومەتیشی گرتەوە
کە بەشێوەیەکی تەقلیدی هەر لایەنگری حکوومەتی عێراقی بوونە لە
سەردەمی مەلەکی و قاسمی و عارفی، هەتا سەردەمی بەعس!

ئامانجی نەخشەکە لە دوایدا ڕوون بووەوە، ئەوە بوو: دووبارە وێنە
کێشانەوەی کوردستان بەخاك و خەڵکییەوە، لە سەر بناغەی نەخشەکە

دوای ١٩٧٥ بەشێوەی ڕووبەری فراوانی خاڵی و بەتاڵ لە هەموو نیشانەیەکی ژیان و چێنراو بەڕەبایەی سەربازی و سەربازگە و کێڵگەکانی مین، ڕکە ڕێگای دروستکراو دەیانبڕێت بۆ تێپەڕبوونی ئۆتۆمبێلی سەربازی و زریپۆشەکان، گوندە ڕووخاو و بێ ژیانەکانیش لەمدیو و ئەودیوی ڕکە ڕێگەکانەوە لەگەڵ زەویدا تەخت کراون... بەم نەخشە ئەمنییەوە جموجۆڵی پێشمەرگە زۆر گران دەبێت، ئەگەر مەحاڵ نەبێت.

**ئامانجی دووەم:** گرتنی هەموو گەلی کورد لە نزیکەی ٥٠ شار و شارۆچکە و گۆڕینی بۆ بەندیخانەی گەمارۆدراو بەبازگە و کێڵگەی مینرێژکراو. هەروەها ئامانجی نەخشەکە ئەوەیە، کە باری ئابووریی کشتوکاڵی و ئاژەڵی کوردستان بەتەواوی بڕووخێنرێت و بارێکی ئابووری تر لە جێگەیان دروست بکرێت، کە پشت ببەستێت بەکۆمەکییەکانی دەسەڵاتی مەرکەزی، کە ئەمەش چەند بارێکی سیاسیی نەگونجاوی بەدواوەیە بۆ دروستکردنی پێگەیەك بۆ بە عەرەبکردنی ناوچەکە.

تاوانی ئەنفال لە کاتی جەنگی ئێران ڕووی نەدا، بەڵکو دوا قۆناغەکانی (حەوتەم و هەشتەم) کە درندەترینیان بوو و ناوچەکانی بادینان و گەرمیانی گرتەوە، دوای تەواوبوونی جەنگی عێراق – ئێران ڕووی دا. هەروەها لە کاتی شەڕی نێوان هێزەکانی پێشمەرگە و سوپای حکوومەتدا ڕووی نەدا، چونکە هاوڵاتییەکان ئامانجی هەڵمەتەکە بوون.. لێرەدا دەگەڕێمەوە بۆ ڕێنوێنییەکانی کەتیبەکانی فرانکۆ، کە داوای ئەنجامدانی گەورەترین سزا دەکات بۆ ئەو کۆمەڵانەی داڵدەی کۆمارییەکان دەدەن و لێدانی ئەو کۆمەڵانە لەو شوێنانەی تێیدا کۆبوونەتەوە (ئەو ترس و تۆقینەی تووشی هاووڵاتییان دەبێت، دەبێتە هۆی ڕووخانی وورەی هێزە پاشەکشێ کردووەکان)... تۆقاندن، هان دەدات بۆ خۆبەدەستەوەدان، وا

دەکات هەموو داکۆکییەك ئەستەم بێت، بەرامبەر هەموو کردارێکی شێتانە بۆ جێبەجێکردنی شتێك لە ڕێگەی گەورەیی تاوانەکەوە. ئەو بێدەنگییە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییە، بەلای خودی جەلادەکانەوە زۆر باش بوو، بۆیە بەبێدەنگی قۆناغەکانی تاوانەکەیان جێبەجێ کرد. ئەو پەندەی کە دەڵێت (الغاية تبرر الوسيلة) لەسەر ئەم بارە ناگونجێت، چونکە ئیرهاب لێرەدا ئەمانجەکەی خۆی ون کردووە و بووەتە شێواز و ئەنجام پێکەوە. چونکە ئەو ئافرەت و پیر و منداڵانەی کە کوژران، دوای ماوەیەکی باش هەڵمەتەکە کوژران، بەدیلی لە دەوری گۆڕی بەکۆمەڵی پێشتر ئامادەکراو کوژران. لە شوێنێك دوور لە ناوچەکانی نیشتەجێبوونیان و دوور لە بوونی پێشمەرگە.

لەم شوێنەی ئێستای خۆمەوە، ناتوانم وێنەکە بەتەواوی بێنمە پێش چاوی خۆم، بۆ ئەوەی ڕووداوەکە نزیك بکەمەوە، پەنا دەبەمە بەر سەیرکردنی فیلمێکی دیکۆمێنتی، دزەی کردووەتەوە ناو بەرهەڵستکاران، وێنەگرە تایبەتەکەی عەلی حەسەن مەجید لە کاتی پرۆسەی سەرکوتکردنە خوێناوییەکەی حەرەس جمهووری بۆ ناوچەکانی سووق لشیوخ دوای سەرنەکەوتنی ڕاپەڕین گرتوویەتی... لە فیلمەکەدا کۆمەڵێك خەڵك لەسەر زەوی درێژ کراون دەستیان لە پشتەوە بەستراوە و چاویان بەپارچە پەڕۆیەك بەستراوەتەوە، بۆیە توانای بەرگرییان نەماوە و دوژمنەکەشیان کە ئەشکەنجەیان دەدات لێیانەوە دیار نییە. وا باوە کە باری کەسی دۆڕاو و بێ دەسەڵاتی بەم شێوەیە، جۆرە هێورییەك و باوەڕ بەخۆکردنێك بدات بەکەسی سەرکەوتوو، بەڵام لەم دیمەنانەدا هیچ کەسێکی سەرکەوتووی ڕاستەقینە بەدی ناکرێت، بەڵکو هەردوو لا دۆڕاو بوون. هاووڵاتییان و سەربازەکان بەرگرییە پەرت و بڵاوەکەیان بەرامبەر بەپاشماوەی ئامێرەکانی دەسەڵاتی چەوسێنەر دۆڕاوە، دەسەڵاتێکیش لە جەنگێکی دەرەکیدا دۆڕاوە و دەیەوێت دۆڕانەکەی خۆی بەسەرکەوتنێك

قەرەبوو بكاتەوە، كە هەندێك هەستی بڕوا بەخۆبوونی بۆ بگەڕێنێتەوە... دوژمنی ناوەوە بووەتە سنگێك، دۆڕاو دەیەوێت زەلیلی دۆڕاندنە دەرەكییەكەی خۆی پێیدا هەڵواسێت. هەرچەندیش قورسایی دۆڕاندنە دەرەكییەكەی بەسەریدا زیاد بكات، توندوتیژی ئەمیش بەسەر دوژمنە ناوەخۆییەكەیدا زیاد دەكات، بەشێوەیەك ژمارەی قوربانییە سەركوتكردنەكانی ناوەوە هیچ جۆرە هەستێكی كەیف خۆشی و بڕوا بەخۆبوونی بەڕژێم نەبەخشی. چونكە هەموو كردەوەكانی ئەو سەرباز و ئەفسەرانەی بەسەر خزم و كەسەكانی خۆیاندا نواندیان و پێی سەركەوتن لەم فیلمەدا بەتۆقاوی و ترساو و تووڕە دێتە بەرچاو، لە ئەنجامدا بەتوندوتیژی زیاتر مامەڵە دەكات ...

ترسی ئەو كەسەی كە لەقە دەهاوێ و سزا دەدات و لێ دەدات، لەوەوە هاتووە، كە ئەو بەدیلەی ئێستا بەستراوەتەوە لەسەر زەوی و بەدەم لێدانەوە دەتلێتەوە، پێش كەمێك خەریكبوو سەركەوێت. ئینجا دەبایە ئەم لە جێگەی ئەو بێت و دەشزانێت چەندە قین لە دڵە بەرامبەری. ترس لە ڕێگەی لێدانەكەوە پێناسەی خۆی دەكات، بۆ ئەوەی خۆی لەو مۆتەكەیە ڕزگار بكات، پێویستە لەسەر (سەركەوتوو) ڕاستی ئێستای خۆی بچەسپێنێت بەشێوەیەكی بەرجەستەكراو، ئەویش بەبەردەوامبوونی لە لەقە وەشاندن بەنەفەسێكی پچڕپچڕ و توند... هیچ مۆڵەتێك بۆ ئەو سەربازانە نییە، كە سەرۆكەكانیان لە پشتیانەوە وەستاون، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە یا تەنیا تەماشاكەر بن، بۆیە دەبێت هێڵی دوودڵی بەكردار ببڕن. چەندیش ناوێتەی كردارەكە بن، ئەوەندە ڕێگە لە هەستی مرۆڤایەتی خۆیان دەبڕن، كە لەوانەیە نازاریان بدات..

چەند قوربانییەكە لاواز بێت، ئەوان ئەوەندەی تر توندوتیژ دەبن و پێ دەنێن بەسەریدا، بۆ ئەوەی بڵێن ئەمە بوونەوەرێكی مرۆڤ نییە، بەڵكو شتێكی زیانبەخشە و شایانی ژیان نییە، بۆیە پێش ئەوەی بیكوژن زەلیلی

دەکەن... ئەم فیلمە هەڵوەستەیەکی پێم کرد، لەم کاتەی کە لەسەر ئەنفال دەنووسم دووبارە گەڕامەوە بۆ بینینی، چونکە وێنەکانی کوشتنی بەکۆمەڵم بۆ نزیك دەکاتەوە. بکوژ هەر عەلی حەسەن مەجید خۆیەتی بەبێ کیمیاوی. لە باگڕاوندی وێنەکەدایە، بەڵکو هەندێك جار لە کرۆکی وێنەکەدایە و خۆی قەسابخانەکە بەڕێوە دەبات.. فەرمان دەدات، ئەگەر بێدەنگ بوو، ئەوا بۆشایی بێدەنگییەکە بەکردەوەی زۆر دڕندانە پڕ دەکاتەوە.

دوژمنەکەش هەر هەمان دوژمنە، بەڵام بەگۆڕانی شوێن و کات: ڕەوتێکی زۆری مرۆڤ (لە سووق لشیوخ بۆ بەسرە و هەموو ئەلجوابر) هەروەکو فیلمەکە خۆی باسی دەکات.. لەم ڕەوتەدا تاوانبار و بێ تاوان نییە، حزبی تاوانبار و بێ تاوانیش نییە، هەموو تاوانبارن و پێویستە لەناو بدرێن.

ناچمە ناو وردەکاری ڕووداوەکەوە، نزیکەی ١٠٠ هەزار کوژران لەم هەڵمەتدا و نیو ملیۆنیش لە جێ و زێدی باب و باپیرانی خۆیان بەزۆر دەرکران. بەڵکو وردەکارییەکەی بۆ شاهێدەکان لێ دەگەڕێم، با ئەوان باسی هونەرەکانی مردن و جۆرەکانی و ئەو شێوە ئەندازەیییەی قوربانییەکانی پێ وەستێنرا لە کاتی گوللەڕێژکردنیان بکەن.

**دەگەڕێمەوە بۆ حاڵی سەرەتا و دەڵێم:**

تاوانی ئەنفال لە تاوانەکانی پێش خۆی بەجیا نەبوو، چونکە ئەو تاکتیکی هەڵمەتبردن و کۆکردنەوە و کوشتنی بەنهێنی و شاردنەوە بەکۆمەڵەی دووچاری ٨ هەزار بارزانی بوو، بەورد و درشتیەوە لە هەڵمەتی ئەنفالدا ئەنجام درا... هەڵمەتەکەش درێژەپێدەری بەرنامەیەکی سەرکوتکاری بوو، کە تاوانبارەکەی بەهیچ شێوەیەك لێپرسینەوەی لەگەڵدا نەکرا، نە لەلایەن حزبە سیاسییەکانەوە، نە لە لایەن وڵاتانی جیهانەوە... چونکە لە ژێر شاڵاوی لێدانەکان و دووبارەبوونەوەی تاقیکردنەوە تاڵەکان بەبێ پێداچوونەوە، هێزە بەرهەڵستکارە

عێراقییەکان تووشی شێوازی لە بیربردنەوە بوون.. لە ئاستی تەماشاکردنی هەر تاوانێك بەجیا لەوی تر، ڕەنگە تاوانێکی گەورەتر ئەوەی پێش خۆی داپۆشێت. یا لە هەر دانوستانێکی سیاسیدا لەگەڵ ڕژێم یەکسەر لاپەڕەیەکی نویێ دەکرێتەوە، لە هەموو قۆناغەکانی دانوستانەکانیشدا قەت ڕژێم داوای ڕەخنەیەکی جیدی بۆ تاوانەکانی پێشووی نەکردووە، بەڵکو هەموو لایەنەکانی بەشدار بوو لە دانوستانەکە چاوپۆشی دەکەن لەو تاوانانەی بەرامبەر بەیەکتری کردوویانە... هەروەها هێزە بەرهەڵستکارەکان تووشی خەیاڵاوێکی بەردەوام بوونە، ئەویش ئەوەیە: دەڕوانتە هەر تاوانێك بەپێوەرە کاتییەکەی، بەهیوای ئەوەی بارەکە لە داهاتوودا هێور ببێتەوە، دوای ئەوەش جووڵە بگەڕێتەوە بۆ دەوڵەت.

بەڵام کەچی زمانحاڵی واقیع پێمان نیشان دەدات، کە دوژمنی چاوەڕوانکراو، یا ئەوەی ڕاپۆرتی بەعس ناوی لێ نا (یەدەگەکانی شۆڕشی پێچەوانە) گۆڕاوە، درێژ دەبێتەوە بەگوێرەی پانتایی و کات و بەگوێرەی بزووتنەوە زۆرداریەکانی ڕژێم. توانای لەبیرکردن لە لای جیهان و قوربانییەکانی بەلای بەعسەوە خۆش بوو، چونکە هەروا بەبێ لێپرسینەوە لە قەسابخانەکەی پێشوو لە یادگاری عێراقدا مایەوە.. بۆیە دەستی بەقەسابخانەیەکی تر کرد و لەگەڵ هەر لایەن و هێزێکدا بەجیا مامەڵەی دەکرد. ئەوە بوو کاتێ ڕێککەوتننامەی ١١ ئادار بڵاو کرایەوە، کە بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد ساز کرا، شیوعییەکان ویستیان پشتگیری خۆیان بۆ ڕێککەوتنەکە دەربڕن بە بەشداریکردن لە خۆپیشاندانە فەرمییەکە، بەڵام هێزەکانی ئەمن هێرشیان کردە سەریان و ئەو دروشمانەی هەڵیان دابوو هەموویان دڕاند و دەستیان کرد بەهەڵمەتی گرتنیان، هەروەها شەڕی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزراند لەسەر بناغەی ڕێککەوتنی لەگەڵ یەکێتیی نیشتیمانیی

کوردستاندا، هەرکە گەیشتە ڕێککەوتنێکی ئاگربەس لەگەڵ پارتیدا، دەستی کرد بەتوندکردنی هەڵمەتەکانی لەسەر شیوعییەکان.

لە تشرینی دووەمی ١٩٧١دا بەعس ڕەشنووسی گرێبەندی کاری نیشتیمانیی پێشکێش کرد، لەو کاتەوە نزیکبوونەوە لەگەڵ شیوعییەکاندا دەستی پێ کرد، وەك داپۆشینێك بۆ توندکردنی هەڵمەت لەسەر کورد، ئەمە بەسەر کورد و عەرەبی عێراقدا هات.

هەموو جارێ قەسابخانەکان لە کوردستان ڕووی بدایە، کەشوهەوایەکی هاوپەیمانی و ئاگربەسی بەدرۆ لە بەشە عەرەبییەکە ساز دەکرا. چەندەها جار حزبە کوردییەکان باوەڕیان دەهێنا بەتوانای ئاگربەسی و دانوستاندنێکی برایانە لەگەڵ ڕژێمدا، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەو تاوانانەی تووشی هێزە سیاسییەکانی بەشە عەرەبییەکە دەهات. بەم شێوەیە، لە جیاتی ئەوەی هەموو پێکەوە بجەنگن لە پێناوی دیموکراتییەت بۆ هەمووان، ئامانجی گفتوگۆ دەگۆڕێ بۆ شەڕی دابەشکردنی دەسەڵات بەهەموو خوێنێکییەوە!

ئەم کارە تەنیا بۆ سەر حزبەکان نەبوو، چونکە بەنەمانی ڕۆشنبیریی مافە یاساییەکانی هاووڵاتی، ئەم جۆرە بەرەڵلاییە بڵاوبووەوە، هەروەها بەنەمانی ڕۆشنبیریی هاووڵاتی بۆ مافە یاساییەکانی، جۆرە تەسلیمکردنێکی ئەم مافە بوو بۆ قەدەر، ئەمەش ئاسانکاری بۆ دەسەڵات و تەنانەت بۆ هێزەکانی تریش دەکات، کەوا هەموو شتێك بۆی هەیە بکرێت و دەکرێت لە ڕێی ئیرهابەوە هەر جۆرە چارەسەرێك بسەپێنرێت بەسەر واقیعدا.

ئەگەر وا نەبێت، ئەی چۆن دەتوانرێت هەر چ جۆرە چارەسەرێك بسەپێنرێت بەسەر واقیعدا لە ڕێی ئیرهابەوە. یا چۆن دەتوانرێت ئەو هەموو حەشاماتەی خەڵکە لە دوای یەك ببرێت، بەبێ ئەوەی ئەو هەموو قوربانییانە هیچ هەرایەك بکەن، یا خزمەکانیان لە شارەکان هیچ هەڵوێستێك بنوێنن. یا ئەو هەموو ژمارە قوربانییانە چۆن ئاوها بەئاسانی خۆیان بەدەستی جەللادەکانەوە دا، لە کاتێکدا ئەزموونەکانی پێشوو دەیانسەلماند کە مردن وا بەڕێوەیە. ئەی بۆ بەبێدەنگی تەسلیمی مردن بوون؟!

## كوردستان . . گەڕانەوە بەئاراستەی پێچەوانە

ئەمجارەیان لە دەرگا شەرعییەکەیەوە و بەقافڵەیەکی ڕەسمی هاتمەوە کوردستان، چەکدارانی سەرکردایەتیش پاسەوانییان دەکردم، قافڵەکە بەخێرایییەکی زۆر بەسەر شەقامە قیرتاوەکەدا دەڕۆیشت، ئەو شەقامەی کە ڕۆژانی پێشمەرگایەتی شەوان بەوریایی و خێرایی بەسەریدا تێپەڕ دەبووین. جاران شەقامە قیرتاوکراوەکە دوژمنی هەمیشەییمان بوو، چونکە تانك و زرێپۆشەکانی ڕژێم بەسەریدا دەهاتن، لە هەردوو لایەوەی ڕەبایەکانی سوپاکەیان، کە بەشوێنمان دەکەوتن چێنرابوون. قافڵەکەمان لە هەولێرەوە بۆ بارزان بەرەو دهۆك، لەسەر شەقامەکەی حکوومەت گوزەری دەکرد، چاوی پاسەوانەکانیشمان دەیڕوانییە ئەو چیایانەی جاران داڵدەمان بوون، بەڵام ئێستا پێشمەرگەکانی پەکەکە لێیان دێنە خوارەوە، وەك جارانی خۆمان بۆسە بۆ ئۆتۆمبێلەکانی حکوومەت دادەنێنەوە. کاتێك لەسەر ئەو شەقامە بووین، هەستم نەکرد ئەوان بۆ من مەترسیدارن، هاوکات هەستیشم بەسەرکەوتن نەدەکرد، چونکە ئێستا من بوومەتە ئەو حکوومەتەی کە دژی دەجەنگاین... ئێمە ئەم زەوییەمان ڕزگار نەکرد، بەڵکو بۆ مانیان ڕزگار کرد.

لەسەر ئەم شەقامە قیرتاوە، لە نێو ئەم قافڵە ڕەسمییەدا کاتێك دابەزیمە ناوشار، هەستم کرد من لەگەڵ شاخی هاوڕێمدا تەپرەشیم کردووە، هەستم بەشڵەژانی باری شوێنەکان کرد، کاتێك هەوڵی دۆزینەوەی خودی خۆم دەکرد لەو جێگە نوێیەدا. بۆیە شڵەژانی جێگە و زەمەن دەگەڕێنمەوە بۆ

شوێنەکە. چونکە ئەو پێشمەرگانەی کە لەگەڵیاندا دژی حکوومەت شەڕمان دەکرد، ئێستا بوونەتە پیاوی حکوومەتە نوێیەکە. سەریان سوڕماوە لە نێوان پێشوازیکردنی میوانێکی وەك من و دروستکردنی ڕاستی ئەو جێگەیەی کە ئێستا تێیدانە. بۆیە سەرۆك مەسعود بارزانی بۆ ئەوەی جێگە ڕەمزییەکەی خۆی بهێڵێتەوە لە بەرامبەر جێگە ڕەسمییەکەی ئێستای، بە جلوبەرگی پێشمەرگەوە مایەوە:

– "ئێمە ئێستا وڵات بەترسەوە بنیات دەکەینەوە، چونکە پێشتر فێر بووین کە پرد و ڕێگەکان خاپوور بکەین، ئێستاش دەبێت دروستی بکەینەوە. جاران شەڕمان لەگەڵ حکوومەتدا دەکرد، ئێستاش دەبێت ئەو حکوومەتە بنیات بکەینەوە".

چیا بنەمای پارتەکان و بنەمای سایکۆلۆجی کادیرەکانی شاری گۆڕی. چونکە ئێستا کادیری پارتیی شاری، پێویستی بەپاشکۆیەکی چەسپاو نییە لەبەرئەوەی لە ناو شارەکەیدا تێ دەکۆشێت و خۆی لە لای خزمەکانی دەشارێتەوە و بژێوی لە لای ئەو خانەوادانەی پاڵپشتی پارتەکەی دەکەن پەیدا دەکات. ئەو دوای پارتییەکانیش بەداهاتی کارە ئاساییەکانی خۆیان دەژین، وەك: کرێکاری، کاسبکاری، فەرمانبەری دەوڵەت. جاران هەڵمەتە چەوسێنەرەوە توندەکان، پارتیی بەرەو گوندایەتی برد، لە شاری ڕژێمەوە بەرەو گوندە دوورەکان ئاوارە بوون، لەوێش ئەندامە لادێییە زاناکان بەبارودۆخی شوێنەکەیان و پێوەندییە کۆمەڵایەتییە گوندییەکان زاڵبوون بەسەر ئەندامە غەریبەکانی شاری. کاری سەربازیی قورس لە ناوچە شاخاوییە سەختەکاندا بەسەر کاری فکریی قۆرغکراوی ئەفەندییەکانی شاردا زاڵ بوو، هیچ پێوەندیشی بەچیاوە نەبوو. هاوکات لە نێو پێشمەرگەکانیشدا گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانی سەربازی و عەشیرەتگەری بەسەر قەناعەتی گفتوگۆی فکری و جەدەلی حزبدا زاڵ بوو. هەستی ڕق بەرامبەر بەتەکنۆقراتیی شار، کە بەسەر هەموو زەمانێك و

ڕژێمێکدا تێپەڕیوە، لە دەروونی ئەوانەی لە چیا هاتنە خوارەوە مابوو. ئەم هەستەش لە نێوان پیاوانی چیا و پیاوانی شاردا بۆ هەر کوێیەکی کوردستانی ئازادکراو بڕۆی دەبینی. تەکنۆقراتییەکان و ڕۆشنبیرانی شار، فەرماندەکانی چیا بە(پاسداری کۆن)ی حزب ناو دەبەن، کە دژی نوێگەرین، تاوانباریشیان دەکەن بەوەی دەستیان بەسەر هەموو پلە و پایەیەکدا گرتووە، کە پەیوەندی بەئاسایش، پارە، سیاسەتەوە هەیە "ئەزموونەکەی جەزایر دووبارە دەکەنەوە". کەچی (پاسدارە کۆنەکان)یش، کوڕانی شاری بەوە تاوانبار دەکەن، کە خزمەتی بەعسیان کردووە و کەم ئەزموونیی ئیدارەیی پیشمەرگەیان بۆ وڵات بەهەل زانی، بەپلە و پایەکانی دەسەڵاتدا سەرکەوتن. داوونەریتی یەکلاکردنەوەی ئەم ململانێیە بەزەبری شەڕی ناوەخۆ ئەفەندییەکانی پەرلەمانی خستە خەجاڵەتەوە، ئەوە بوو زۆربەیان وەك نارەزاییەك دژی شەڕی ناوەخۆ لە ناو تەلاری پەرلەماندا بۆ ماوەی ١١٠ ڕۆژ مانیان گرت. چەکدارەکان نەچوونە ناو بینایەی پەرلەمانەوە، بەڵکو مانگرانیان هەر ئاوها لە ناو ئەو بینایە کەشخەیەدا لێ گەڕا.

سەرۆکی پەرلەمانیش د. ڕۆژ نووری شاوەیس منی برد بۆ ئەوەی شوێن و جێگەی کوتلە سیاسییەکانم پێ نیشان بدات، هەروەها ئەو پەنجەرەیەی پەرلەمانتاران لێیەوە دەیانڕوانییە ئەو شەڕەی لە شەقامێکەوە بۆ شەقامێکی دیکە، لە بینایەیەکەوە بۆ بینایەیەکی دیکە دەگوازرایەوە. گوێیان لە هەواڵەکانی تەلەفزیۆن دەگرت، تەنیا بەگفتوگۆش کۆتاییان پێ دەهێنا، کە لەوە زیاتریان بەدەستەوە نەبوو. کەچی لە دەوروبەریان کێشەکان بەزەبری چەك، بەستایلی پێشمەرگەی جاران دەبڕایەوە.

ئەو ململانێیەی بەینی هەردووکیان لە تاکێکدا دەمبینییەوە. چونکە کاتێك دەچمە دیدەنیی پیاوانی چیا، کە ئێستا بوونەتە پیاوانی دەسەڵات، لە دوای مێز و کورسییەکانیانەوە بەشەرزەییەوە دەردەچن، چونکە لە

شوێنێکی هەڵەدان، بەخەجاڵەت و لێبووردنەوە دەستی تەوقەکردن درێژ دەکەن، چونکە ئێمە کاتێك گۆڕاین، چیای باوکمان شەرمەزار کرد، بووینە کوڕی شاری، بووینە پیاوی ئەو دەسەڵاتەی جاران دژی دەجەنگاین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك لە شار بووم نەمتوانی لە بەراوردکردنی نێوان هەردوو جێگەکە و هەردوو شوێنەکەدا ڕزگار بم. بەوردی تەماشای بۆیە ڕەشەکەم دەکرد کە سپییەتی سەریان پێی داپۆشیوە، زەمەنی ماندووبوونی چیایان سڕیەوە، خۆیان وا پیشان دەدەن کە هەوڵ دەدەن لەگەڵ ئەم ژوورە ڕەسمییانەدا ڕەسەن بن. لەوانەیە ئەم گەندەڵیی مادی و ئیدارییەی لەگەڵ دەوڵەتی نوێدا پەیدا بووە هەندێك بێت لە قەرەبووی زەمەنی نەبوونی و کوڵەمەرگیی جاران. کاتێك چاوم بەهەڤاڵانی چیا دەکەوت، بەئەنقەست ئەتەکێت و برۆتۆکۆلم بەکار نەدەهێنا، باسی بەسەرهاتەکانی چیام لەگەڵیاندا دەکرد. هەرکە بیرەوەرییەکان خۆیان هەڵدەدا، ڕووکەشی جدیی و خۆتەسککردنەوە لادەچوو، مزەخەنەیەکی منداڵانە و هەستێك جێگەی دەگرتەوە، کە ئەو زەمەنە زەمەنی بەرائەت و پاکی بوو، هەرچی ئێستایە بەقاتی ڕەش، بۆینباغ، بۆیەی پرچ، ئەمانە هەمووی پێویستییەکانی دەسەڵاتی ئێستا بەسەریاندا سەپاندوویەتی. خۆم بۆ نەگیرا، وەبیری یەکێك لەو فەرماندانەم هێنایەوە کاتێك لە چیا داوەتی کردم لە چێشتخانەیەکی گرانبەهای ئەوێ، لەسەر مەرگەی نۆکاو و خواردنی (سی سی) هەرسێ پێشمەرگە لەسەر قاپێك نانیان دەخوارد. ئەوە کاتێك بوو، ئێستاش کاتێکی دیکەیە. بەشەرمەوە پێی وتم، وەك بڵێی دەیەوێ نکوڵی لە مێژوویەکی پڕ وەهم بکات.

بەسەر سۆزەکانی خۆمدا زاڵ دەبووم، بۆ ئەوەی هەقیان پێ بدەم.. هیچ ڕێگەیەکی دیکەش نییە لەم هەموو خۆبەدەستەوەدانە نەبێت بۆ ئەوەی ئەو دەوڵەتەی کورد خەونی پێوە دەبینی بنیات بکرێت. لە نێوان خۆشماندا هەوڵم دا هەڵوێستی خۆم دیار بکەم وەك ڕەخنەگرێك و هاوپەیمانێك بۆیان.

## بەشوێن پێی قوربانیاندا کەوتووم

بۆ جارێکی دیکە سەردانی کوردستان دەکەم، بەڵام خەمێکی زۆر سەراپای گرتووم، دوای ئەوەی بۆ ماوەی مانگ و نیوێك بەشوێن وردەکاریی قەسابخانەکەی هەڵەبجە و ئەنفال و چارەنووسی قوربانییەکانیاندا کەوتم.

ئەو کچە ڕۆژنامەنووسە گەنجەی لەگەڵماندایە و لە ناو ڕووداوەکانی ئەو کارەساتانەدا ژیاوە، هێشتا وردەکاریی ئەو چرکەساتەی لە یاد ماوە:

* کاتژمێر ٧ی بەیانیی ڕۆژی ٢٤ی نیسانی ١٩٨٨ نزیکەی ٢٠ فڕۆکەی عێراقی هێرشی کردە سەر شاری هەڵەبجە و گوندەکانی. داپیرەمان لەگەڵماندا بوو، ڕامان کردە ناو کونە تەیارەکەوە. دوای تەقینەوەیەکی بەهێز لە کونە تەیارەکەوە هاتینە دەرێ، دووکەڵێکی سپی و بۆرمان بینی وەك گوڵێك پان بووبووەوە.

* بۆنێکمان کرد، بۆنی سێو بوو.

* نەخێر، بۆنی کبریت و پیازی لێ دەهات.

خەڵکانێکی دیکە گوتیان بۆنی ترێیە.

کەس نەیدەزانی ئەم دووکەڵەی سەری شارەکە و دەوروبەری داپۆشیوە مردنە، تێکەڵاوێکە لە سیانید، غازی خەردەل و دەمار.. ئەوانەی هەستیان بەمەترسییەکە کرد، بەرەو بێستانەکان و ناوچە کراوەکان ڕایان کرد. بەڵام ڕژێم هەموو ڕێگەیەکی گەڕانەوەیانی لێ گرتبوو، بەهۆی بۆردومانکردنی ئەو ناوچانە بەتۆپی دوورهاوێژیی ژەهراوییەوە. ئەوەی بەسەر پیر و منداڵ و ژنی ئەو شارەدا هات ئێستا بۆ جیهان ڕوونە: پێنج هەزار کوژراو لە ماوەی چەند سەعاتێکدا.. هەندێکیان لە ناو کونە

تەیارەکاندا خنکان، یا لە دەوری سفرەی نان خواردندا، یا بەسەر یەکدا لە ناو ئەو ئۆتۆمبێلانەی هاتبوو بۆ شوێنێکی دوور بیانگوازێتەوە مردبوون.
کچە ڕۆژنامەنووسەکە ئەم دیمەنەی بۆمان گێڕایەوە:
دەموچاومان بەپەڕۆی تەڕ داپۆشیوە و بەرەو چیاکان هەڵکشاین، ڕۆژی دووەم کەمێك دابەزینە خوارەوە بەدووربین سەیری شارەکە و دەشتی شارەزوورمان دەکرد. چەند هەلیکۆپتەرێك بەسەر دیمەنەکاندا دەفڕین، لەوانەیە فەرماندەکانیان ویسوویانە دڵنیا بن لە کاریگەری داهێنانەکەیان.
* ئەو ڕزگارکراوانەی بەبۆنەکە خنکابوون، بەیەك وشە ڕووداوەکەیان بۆمان وەسف کرد:
* ڕۆژی مەحشەرە!
ئەو دڕندایەتییەی قەسابخانەکەی هەڵەبجە ئەنجامێکی کتوپڕی سزادان نەبوو، بەڵکو دڕندایەتیی پێویستییەك بوو. وێنەکەشی لە خەیاڵی ئەو کەسەی بڕیارەکەی دا بەرجەستە بووبوو. ئەنجامەکانیشی تاقی کرابوونەوە پێش بەکارهێنانی. ئامرازەکانیش هەن کەواتە جێبەجێکردنەکەی لەسەر بڕیارێك وەستاوە. ئەو دەسەڵاتەی بڕیارەکەی دا (مەجلیس قیادە سەورە) پێویستی بەمەهانەی تاوانێك نەبوو، وەك هاوپەیمانی پارتە چەکدارە کوردییەکان لەگەڵ ئێراندا، چونکە سزاکە پێش ڕوودانی تاوانەکە دەرچووبوو، بەبڕیاری (بنبڕکردنی چالاکیی موخەربین) کە واتای خاڵیکردنی خاك لە دانیشتوانەکەی دەدات. بەگوێرەی مەنتیقی وریاکەرەوەی ئەمنی، مەرج نییە سزاکە بەقەد تاوانەکە بێت، نە لە ڕووی کەسایەتیی تاوانکار، نە لە ڕووی هاوکاتی و هاوشوێنی لەگەڵ تاوانەکە. بەڵکو پێویستە سزایەکی توندوتیژ بۆ تاوانێك هەبێت. با ئەو سزایەش تەنیا لە ڕووی مەعنەوییەوە بێت. بەڵام دەبێت پێش سزاکە ئەو تاوانە ڕووی دابێت، کە هێشتا نەبووە. ئەم سزایەش

بەسەر هەر تاوانبارێکدا دەسەپێنرێت، بۆ هەر تاوانێکیش بێت، با هەموو بزانن چ درندایەتییەك چاوەڕێیان دەکات.

بەدوای شوێنەواری قوربانییاندا دەڕۆم، بەو ڕێگەیەی وەك مار درێژ بووەتەوە لە نێو گرد و دۆڵە سەختەکانی گەرمیان.. دەسەڵاتدارە نوێیەکانیش هیچی تازەیان بۆ ئەم گوندە خاکبەسەرانە نەکردووە. شوێنەواری ئەو گوندانەی سەدام بەشۆفڵەکانی ڕووخاندی هەروەك خۆی ماونەتەوە. هەموو شتێك وەك خۆی ماوەتەوە، هەر دەڵێی ئەنفال دوێنێ ڕووی داوە. ڕادیۆی ئەو ئۆتۆمبێلەی بەنێو ئەو شوێنەوارانەدا ئێمەی دەبرد گۆرانییەکەی کوردی دەچڕی لەسەر مەقامی سەبا بوو، منی بەرەو هاماجێکی فراوانتری دیمەنەکە پەلکێش دەکرد: گوڵە بەیبوونە وەك پەڵە هەورێکی زەرد بەدەوری تاویرە گڕکانییەکاندا سەوز بوون، کە هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا گڕکانەکان فڕێی داون و خەریکە ببن بەهێما. ئەو دیمەنانە و ئەوانەی لەگەڵمدان لە ناو ئۆتۆمبێلەکە ڕەت دەکەمەوە، ئەو کچە کەنگرچنانەش کە خۆیان ڕاست کردبووەوە و بەناو لەپیان دەموچاوی خۆیان گرتبوو و سەیری ئۆتۆمبێلە حکوومییەکانیان دەکرد ڕەت دەکەمەوە، ڕاوچیی کەوە فێڵبازەکانی سەر گردەکان ڕەت دەکەمەوە، ئێستا و ئافرەتەکان ڕەت دەکەمەوە، بۆ ئەوەی بتوانم ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٨٨ پێش مانگی تەممووز، کاتێك ئەنفالی سێی بەسەر ئەم گوندانەدا جێبەجێ کرا. ئەو گۆڕانە دێنمە قسە، کە بەدرێژایی ڕێگاکە بە پارچە تاوێری پان بەتەنیشت یەکەوە وەك بەژنە زەلام بەسەر ئەو گردۆڵکانەوە وەستاون، کۆمەڵێك گوڵەباخ بەدەوریاندا لە پاشماوەی مادە ئەندامییەکانی ئەو مردووانە گەشەیان کردووە. لەبەر سەختی ڕێگەکە دەهەژێم و بەلادا دێم کاتێك بەدوای ڕێڕەوی ئەو ئەنفالکراوانەی بەسەر ئەم ڕێگەیەدا بەزیلی عەسکەری بردران. ئایا کاتێك بەنزین کرایە سەر گوندەکانیان و بەبەرچاویانەوە سووتێندران لایان کردە دواوە بۆ ئەوەی

دوا دیمەنی گوندەکانیان ببینن؟ ئاخۆ شێوەی ئەو ئافرەتەی بە بەرچاویەوە مێردەکەیان بەچاو بەستراوی برد و بەدوایدا دەیقیژاند دەبێت چۆن بووبێت؟ بەناوی خۆی بانگی کرد "عومەهههر" بەم قیژاندنەشی گڕی لە قیژەی ئەوانی دیکەش بەردا "ههەر ههەر ههەر" لەگەڵیاندا منداڵە تۆقاوەکانیش لە هەژمەتی پاڵەپەستۆی جەستەکاندا لە هەژمەتی ترسناکی دیمەنەکان دەیانزیڕاند. قیژە و زیرەی ئافرەتەکان و منداڵەکان لەم دەشتاییانەدا دەهێنمەوە بەر گوێم، هەوڵ دەدەم هەستی ئەو ئافرەتەی بۆ یەکەم جار قیژەی گورگێکی بریندارى بەردا بەرجەستە بکەم. لە ناو حەشاماتی ئافرەتەکانەوە دەچمە ناو حەشاماتی ئەو پیاوانەی بەزۆر لە هاوسەر و ماڵەکانیان بەچاو بەستراوی وەرگیراون، گوێیان قولاغ کردووە بۆ ڕێگە نهێنییەکان و هێماکانی ئەو ڕێگەیەی ئۆتۆمبێلەکانی پێدا دەڕوات، بۆ ئەوەی دڵنیا بن پاش کەمێکی دیکە لە چ خاکێکدا دەکوژرێن.

عەلی بەرزنجی بەدەم نیشاندانی گوندەکەیەوە لە ناوچەی هەنارە پێی وتم : "دوای ڕووداني قەسابخانەکە لە چیاکان هاتینەوە خوارێ، بینیمان تەنیا سەگەکان پاسەوانی پاشماوەی ماڵە ڕووخاوەکان دەکەن. لە ئێمەی خەڵکی گوندەکە دەوەڕین، ئێمەیەك بەچەکەکانمانەوە بەرەو چیاکان هەڵاتین و گوندەکانمان بەجێ هێشت. هەرکە بەدوای پارچە نانە ڕەقێکدا لە نێو کەلاوەکاندا دەگەڕاین سەگەکان پێمان دەوەڕین. سەرەتا وەڕینەکە بەهێز و توورەییەوە بوو. لە دواییدا بەهۆی دووبارەبوونەوە و لەیەك ڕاهاتنمان بوو بەنووزە.

کاتێك لە نێو کەلاوەکەی خۆمدا بەدوای کیسە ئاردێکدا دەگەڕام، سەگەکەی خۆمان منی ناسییەوە. بەبێ ئاگایی بەناو لەپم دەستم بەسەریدا هێنا. لەو کاتەوە ئەو هاوڕێیەتییەی نێوانمان کە ڕۆژگارێکی سەخت سڕیبوویەوە گەڕایەوە نێوانمان. هاوڕێیەتییەك لەوانەیە ببێتە

هۆی لەناوچوونم، کاتێك بەشەوان بەنێو بۆسەی جاشەکاندا گوزەر دەکەم. سەگی هاورێم بەمنەوە نووساوە و دەبێتە هۆی ئاشکراکردنم، چونکە ئەو بەبینینی غەریب دەوەڕێت، بەڵام من بۆ ڕەشاشەکانیان ئاشکرا دەکات. بۆیە لە چرکەساتێکی خەمۆکی و پڕ عەسری گریاندا بەگولەیەك کە منی لەناخەوە بریندار کرد سەگی هاورێم کوشت".

لە نێو پاشماوەی گوندەکەی عەلی بەرزنجیدا بەدوای بەڵگەیەکی ئەو ژیانەدا گەڕام کە پێش هاتنی ئاخر زەمانەکە هەبوو، لە پارچە بێشکەیەك زیاتر هیچی دیکەم نەدۆزییەوە، نازانم ئەو منداڵەی لە ناویدا بووە چۆن گەورە بووە؟ لە دوورییەکی نزیکەوە چەند قەوانێکی سەربازەکان کەوتبوون کە خەڵکی لادێییەکەیان لەو ڕۆژە لە یاد نەکراوەدا پێی تۆقاندبوو.

گردۆڵکەکانی گەرمیان چۆڵبوونە لە خەڵکەکەی، هیچ شتێك نەماوە تەنیا ژیانێکی پەرتەوازەی نێو تاوێر و گۆڕستانەکان نەبێت، خەڵکەکەی بەدوای سەردەمی نوێ و گەشەکردنی شارە سەقەتەکان، پشیلە قەڵەوەکانی، حەواسم و تالانچییە سفلەکان، ئەوانەی بەهۆی مشووریی سەرکەوتنی خێرای دونیای پارەدا خزم و کەسانی خۆیان لە بیر نەماوە، سەرگەردانن. خزم و کەسەکانیان لە بیر کرد، نووزە کزەکانیان لە بیر کرد، بەجێیان هێشتوون لێویان بگازن تا خوێنیان لێ دێت. هاوکات قوربانیانیش بەسەر تاوێرەکانی گەرمیانەوە بەبێ دڵدانەوە یا تۆڵە سەندنەوە ماونەتەوە.

کۆمەڵگەی بنەسڵاوە نیو کاتژمێر لە هەولێرەوە دوورە، کە پاشماوەی قوربانیانی ئەنفالی لێیە. زۆربەی دانیشتووانی بە هۆی چاوەڕێ کردنی ونبووانیان دووچاری خەمۆکی و وڕێنەکردن هاتوون، پاش تێپەڕبوونی زیاتر لە ٢٠ ساڵ لە چاوەڕوانی، هێشتا کۆڵیان نەداوە لە چاوەڕوانکردنی گەڕانەوەی کەسەکانیان یا تەرمەکانیان. چەند ڕۆژێك لەوێندەرێ مامەوە پرسیارم لێیان دەکرد سەبارەت بەو ڕووداوەی کە بەواتا گشتییەکەی من بەقەسابخانەی دەزانم، بەبێ ئەوەی وردە زانیارییەکانی هیچ ئازارێکی دەروونیم پێ بگەیەنێت.

ئەم تاوانە بەرەتکردنەوەی مافی نەتەوەیی و ئاینی کۆمەڵێك خەڵك دەست پێ دەکات، دوای ئەوە ڕەتکردنەوەی بوونی ئەم کۆمەڵە خەڵکە لە ڕووی عەقیدەوە، ئەم کارەش بەلەناوبردنی جەستەییان کۆتایی دێت.
ئەم هەڵمەتەش شێوازی جینۆسایدی بەکۆمەڵی ئاسایی گرتە بەر، کە لەسەر ٣ بنەما پێکهاتووە: (دەستنیشانکردن . بەندکردن . لەناوبردن) کەچی ڕژێمی عێراقی ئەفراندنێکی نوێی بۆ ئەم ٣ بنەمایە زیاد کرد، ئەویش بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژی هاووڵاتیانی خۆی. ئەم ڕژێمە سورەتی ئەنفالی بەکارهێنا بەپشتبەستن بە ئایەتی: "اذ یوحي ربك الى الملائكة اني معكم فثبتوا الذين امنوا سالقي في قلوب الذين كفروا الرعب فاضربوا فوق الاعناق واضربوا منهم كل بنان" چونکە ئایەتەکە کرداری (اضربوا فوق الاعناق)ی تێدایە، جگە لەو تۆقاندنەی کرداری (القاء الرعب فی القلوب) دەیورووژێنێت. تۆقاندن ئەنجامەکەی خۆبەدەستەوەدانە و هەموو بەرەنگارییەکیش مەحاڵ دەکاتەوە، هەر شتێکیش با چەند سەرشێتانەش بێت، دەکارێ بێتە جێبەجێکردن لە ڕێی گەورەیی تاوانەکەوە.
لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی دیکە دەچووم، لەگەڵیاندا لەسەر زەوی دادەنیشتم، بۆ ئەوەی قوربانییەکان بێنمە قسە و زۆرترین وردەکارییە



بەئازارەکانیان لێ وەرگرم. زۆربەی ئەو هاووڵاتییانەی ڕزگاریان بووبوو: هەرگیز پێشبینیی ئەوەیان نەدەکرد، تەنانەت دوای هەڵەبجەش، چەکی کیمیاوی بەکار بهێنرێت. بەڵکو خۆیان و ژیانیان لەگەڵ تۆپبارانکردن، هێرشی ئاسمانی بۆ سەر لادێکانی کوردستان بەدرێژایی ساڵانێکی دوورودرێژ ڕاهێنابوو. بۆیە زیانەکان زیاتر لەسەر ئەو کەسانە چڕ بووەوە، کە نەیاندەزانی کاریگەری گازەکانی کیمیاوی چییە و ڕێگەکانی خۆپاراستن لێی چییە. دیمەنی زۆر ترسناکیان لەو بارەیەوە دەگێڕایەوە:

- کاتێك لە ناکاودا فڕۆکەکان هاتنە سەرمان شریقەی تەقینەوە بوو لە دەوروبەرماندا، هەندێکیان گوتیان ئەوە گازی ژەهراوییە، هەندێکی دیکەیان ئەو قسەیەیان ڕەت دەکردەوە. هێرشە ئاسمانییەکان مۆڵەتی ئەوەیان پێ نەداین بزانین ئەوە چییە، ئەو فڕۆکانە لەسەر ئاسمانی گوندەکە لانەچوون، ئەگەر کەمێك دوور بکەوتنایەوە ئینجا بۆردومان بەتۆپ و مووشەکەکان هەراسانی دەکردین. ستوونێك لە دووکەڵی سپی وەك خوێی پەرشکراو، یا ڕەشێکی شینباو، زەرد، ئاسمانەکەی تەنی، ئینجا دووکەڵەکە بەرەو زەوی دەنیشتەوە، ئەو کات بۆنی سێوێکی خۆشمان دەکرد، دوای ئەوە نیشانەکانی بەدیار دەکەوتن: تەنگە نەفەسییەك



بەرادەی خنکان، فرمێسکێکی تیژ بەخوڕ دەهاتە خوارێ و پێڵووی چاوەکانی دەسووتاندەوە بە رادەی کوێری، لینجاوێکی سووتێنەر لەسەر پێست دروست دەبوو، پێستەکەی ڕەش هەڵدەگەڕان و دایدەماڵی، لەرزینێکی پچڕپچڕ، گرژبوونەوەیەکی بەهێزی ریخۆڵەکان. هەبوو بەدەوری خۆیدا وەك شێت دەسووڕایەوە، هەبوو دەکەوتە پێکەنینێکی هستیریەوە، لە دوماهیشدا مردن دەستی پێ دەکرد و یەکەم جار منداڵەکانی دەبرد. تەواو وەك ڕۆژی مەحشەر، بەڵام بەجیاوازییەك کە ئەمەیان لە کردەوەی مرۆڤە... ئەو فەیلەقانەی لە بەرەکانی جەنگ لەگەڵ ئێراندا گەڕابوونەوە، هێزەکانی حەرەس جمهووری، هێزەکانی فریاکەوتن، هێزەکانی جەیشی شەعبی، فەوجەکانی جاش، تێکڕای ئەم هێزانە پێکڤە، شێوەی چەنگاڵێکی تۆکمەیان دروست کرد بۆ قەدەغەکردنی دەرچوونی دانیشتوانی شوێنە لێدراوەکان بۆ دەرەوەی بازنەکە. دوای ئەوە کرداری جیاکردنەوەی ئافرەتەکان لە پیاوەکان دەستی پێ کرد، دوای ئەوە کۆچ پێکردنیان: (دوای ئەوەی پیاوەکانیان بەچاو بەستراویی برد، گوندەکانیان پێ چۆڵ کردین و هەموومانیان کردبووە سەر یەکدی، کە سەرمان بەرز دەکردەوە دەمانبینی ئاگر ماڵەکانمان و گوندەکەمانی دەسووتاند، زیرەی منداڵەکان و قیژەی ژنەکان تێکەڵ بەقیرەی پاسەوانەکان بووبوو کە هەرەشەی چارەنووسێکی خراپتر لە دۆزەخیان لێ دەکردین ئەگەر بێدەنگ نەبین).

کورد هەرگیز سێ شوێنی ئەفرەت لێ کراوی لە یاد ناچێت، بەتایبەتی ئەوانەی بەئەزموونی ئەنفالدا تێپەڕیون، ئەویش: (سەربازگەی جەیشی شەعبی لە تۆبزاوا) نزیك کەرکووکە، (زیندانی ئافرەتان لە دووبز) لە نێوان دووڕێیانی کەرکووك–مووسڵە، (زیندانی نوگرەسەلمان) لە بیابانی باشوور بەرەو سعوودیە.

کۆچ پێکراوان گەیشتنە ئەم سێ سەربازگەیە، لە بارێکی نیمچە مردوودا

لە هەژمەتی تەنگی جێگە، گەرمیی هەناسەکان، برسییەتی، تینوویەتی و هەستکردن بەترسی ئایندە. لەم سەربازگانەدا ئەو پیاوانەی توانای هەڵگرتنی چەکیان هەبوو، هێنرانە خوارێ و بەپەتێکی درێژ بەدەم یەکەوە بەسترانەوە.دوای ئەوەی پێیان گوترا ئێوە (موخەربینن) و دەبێت لەناو ببرێن، زۆر ئازار دران و زەلیل کران. دوای چەند جار کردنەوەی ئازاردانیان لە ڕۆخی چەند چاڵێك کە پێشتر هەڵکەندرابوون وەستێنران. چاویان بەسترابوو، ڕوویانیش بەرەو چاڵەکان بوو، گوللەباران کران و بەشۆفەڵ خۆڵیان بەسەریاندا کرد.

پیرەمێردەکان بەرەو نوگرەسەلمان بردران، بۆ ئەوەی لەوێ بەبێ گوللەباران لە برسان و لە تینوێتیدا بمرن، لاشەکانیشیان فڕێ بدەنە بەردەم سەگە هارەکانی دەوروبەری سەربازگەکە.

هەرچی ئەو ئافرەتانەش بوون کە لە زیندانی تۆبزاوا بەند کرابوون، لە ئازار و ئەشکەنجەیەکی وادا بوون، مردن لە ئاستیدا ڕەحمەت بوو. ئازار لە نێوان ترسی پیاوەکانیان کە ڕەوانەی شوێنێکی نادیار کران، ترس لەو منداڵانەی بەسەر سنگیانەوە سیس دەبنەوە لە کەم خۆراکی و کەم شیریدا و ڕۆژی شەشیان لێ دەمرێت. نووسەر نامەیەکی دەست کەوتووە لەسەر پارچە قوماشێك نووسراوەتەوە، باسی ئەوە دەکات چۆن ئەو منداڵانە لە دەستی دایکەکانیان دەسەندرێنەوە و هێشتا نەمردوونە فڕێ دەدرێنە چاڵەوە.

**پرسیارم لە قوربانییان کرد:**

– ئایا بێ سەر و شوێنان دێنە خەوتان؟ چۆن؟

یەکێك لە تەمەنی ٣٥ساڵیدا بوو، گوتی: کاتێك جاشەکان و قوات خاسە هاتن بەسەریاندا، ئەو لە ناو دۆڵابی پۆشاکەکاندا خۆی شاردبووەوە:

– بەڵێ دەیانبینم، وەك چۆن بۆ دوماهیی لە درزێکی دۆڵابەکەوە تەماشایانم کرد، هاواریان دەکرد، منیش لە هەژمەتی هاوارێکی



قەتیسماودا خەریك بوو بخنكێم.

– بەڵێ، هەموو ئێوارەیەك نەوەی كوڕەكانم دەبینم لە دەورم دادەنیشن و منیش چایان بۆ تێ دەكەم.

–هەموو ئێوارەیەك دایكم و باوكم دەبینم لە دەشتاییەكەوە، مەڕەكانیش لە پێشیانەوە بەرەو ماڵ دێنەوە.

– لە دەلاقەیەكی بچووكی بەرزەوە لە پشت دیوارێكەوە، براكەم دەبینم سەری دەهێنێتە دەرەوە، بەدەنگێكی خنكاوەوە بانگم دەكات، لە نێوانماندا دیواری قەڵاكەیە ناهێڵێت پێی بگەم..

دوایی بەگریانەوە لێم دوور دەكەوێتەوە:

– بۆ هاتووی ئەم پرسیارانەم لێ دەكەی؟ بۆ ئەوەی برینەكانم بكولێنیتەوە؟!

گوتیان دوای ئەوەی بینیویانە ژیانیان تامی تێدا نەماوە، ئەوەی بەم ژیانەوە دەیانبەستێتەوە تەنیا چاوەڕوانییەكی تاڵە بۆ هەر هەواڵێك یا زانیارییەك دەربارەی بێ سەروشوێنەكانیان. ئەوان لە ژێر قورسیی دێوەزمەكان و خەونی گەڕانەوەی ونبووان دەناڵێنن و شەو و ڕۆژ بەرۆكیان بەرنادات.

لە كاتی دادگاییكردنی تاوانبارانی قەسابخانەكە، داوام لە پەیامنێرەكانم كرد پرسیار لە چەند نەوەیەك لە عێراقییەكان

بکەن، بزانن گوێیان لە ئەنفال بووە لە کاتی خۆیدا؟ وەڵامەکان بەم شێوەیە بوون:
- نەخێر.
- هەرگیز.
- چیرۆکێکی جیاواز.
تەنانەت لە ناوچە کوردییەکاندا باشترین وەڵام:
- گوێمان لێ بووە، بەڵام نازانین وردەکارییەکانی چین.
سەرم سوڕما، چۆن تاوانێکی وا بەم بێدەنگییە تێپەڕ دەبێت! ١٨٢ هەزار هاووڵاتیی کورد لە تاوانێکی بێدەنگدا بەبێ گەواهی، وەك ڕۆمانەکەی مارکیز لەسەر ڕووی زەوی ون کران. قەسابخانەیەك بەبێدەنگی گەمارۆ درا، تا وای لێ هات قوربانییانی خەریکە دەیکەن بەمۆتەکە.
لە کاتی گوتنەوەی وتارەکەم لە هۆڵی زانکۆ لە هەولێر لە یادی قەسابخانەکەدا دووجار لە تاو هەناسەسواریدا وەستام. کاتێك بەشەکەتی لە شوێنەکەی خۆم دانیشتمەوە، یەکێك لە پشتمەوە دانیشتبوو لەسەر شانمی دا و ئاگاداری کردمەوە لە وتاری هاووڵاتییەکی ناو هۆڵەکە:
* ئەوە باسی تۆ دەکات.
هیچ لە قسەکانی ئەو پیاوە تووڕەیە تێ



نەگەیشتم کە ڕەوتی دانیشتنەکانی بڕی.

* ئەوە دەڵێ وشەکانی ئەو عەرەبە (مەبەستی من بوو) کە ئێستا قسەی کرد هەست و سۆزمی وروژاند، ئەوەی کە غەمبارمی کرد ئەوەیە، ئەو نازانێت هەندێك لەوانەی بەشداری هەڵمەتی ئەنفالیان کردووە ئێستا لە ڕیزی پێشەوە دانیشتوونە.

باوەڕم بەقسەکانی ئەو هاوولاتییە نەکرد، بۆیە بەو برادەرەی پشتمەوەم گوت:

* ئەوە ڕاستە؟!

* بەداخەوە، بەڵێ ڕاستە..

چەمکی لێبووردنن کە پێویستییەکانی شەڕی براکوژیی نێوان هەردوو حزبەکە سەپاندبووی، لە پایەی سەرکردە پێشووەکانی ئەفواج خەفیفەی بەرز کردەوە، کەچی قوربانییان هەر بەئێش و ئازارەکانی خۆیان ماونەتەوە.

# هەولێر و بارزان

من و فەوزی کەریم لە چاوی پاسەوانەکان لە هوتێلی چوارچرا خۆمان دزییەوە و بەرەو ناو شاری هەولێر شۆڕ بووینەوە. فەوزی بەگومانەوە لێمی پرسی:

*ڕێگەکە شارەزای؟ بەزەردەخەنەیەکەوە سەرم لەقاند و مەزەندەی ئەوەم کرد کە تەنیا سووڕانەوەی ڕێگەکەمان لە سەری فولکەکە قەڵاکەمان پیشان دەدات، ئەو کاتیش ڕێڕەوەکان بەدیار دەکەون.کاتێك لە چایخانەی مەچکۆ دانیشتبووین و چایەمان دەخواردەوە، ڕاستییەك دەهاتەوە بەرچاومان کە ئێمە ئێستا لە بەشێکی وڵاتەکەماندایین. لەو کاتەدا بەرێکخستنەوەی شوێن و کاتەکاندا دەچوومەوە. لە جێگەیەك لەم شوێنەدا، لە نێوان قەڵا و بازاڕەکانی دەوروبەری، هۆتێلێکی لێ بوو من و باوکم بەمنداڵیم شەوێك لە سەربانەکەی نووستوومە. ئەو شەوە سەرباری شەکەتیم نەنووستم، چونکە چاوەکانم لەسەر پیرەمێردێکی کۆم ئەبڵەق بووبوون، بەهەنگاوی خاوەوە بەرێگە تەنگەکەی قەڵاکەدا دەیویست سەرکەوێ. سەرەڕای ئەوەی دڵنیا بووم لە نەگەیشتنی، بەڵام لە دەروونمەوە بڕیارم دا نەنووم تا ئەو پیرەمێردە دەگاتە ماڵی خۆیان. بۆ ماوەی سەعاتێك یا دوو سەعات شانم دادابوو، دەمڕوانییە هەنگاوە خاوەکانی و بەهەناسەتەنگەکانم کۆڵم دابووە هەنگاوە قورسەکانیەوە، هەنگاو بەهەنگاو بەهەنگاو، لە کۆتاییدا مامە پیرە گەیشتە سەرەوە، ئەو سەرەی کە لە ماوەی شەش هەزار ساڵدا، شەش شاری بەڕێ کردووە، لەگەڵ پێنج سەردەم. دوای سەرکەوتنەکەی کەوتمە خەو وەك بڵێی من ئەو

دووریيەی سەرکەوتنەکەم بڕیوە.

کاتێك گەورە بووم و لە چیادا ژیام، کوردەکان دانایی ئەو پیرەمێردەیان فێرم کرد لە سەرکەوتنی چیادا:

*هەناسەکانت لەگەڵ هەنگاوەکانت ڕێك بخە. بەسەری پەنجەکانت هەست بەڕەقی زەوییەکە بکە وەك بزنەکێوی، پێش ئەوەی قورسایی جەستەت فڕێ بدەیتە سەر لاقەکەی دیکەت. زیاتر لە توانای خۆی جەستەت هیلاك مەکە. بەڵکو تواناکانت دابەش بکە بەجۆرێك کە بگەیتە سەر لووتکە هێشتا نیوەی توانای جەستەت مابێت، بۆ وریابوون لە شەڕی سەر لووتکەکان.

بەگوێرەی ڕێنوێنییەکانی ئەو پیرەمێردە چوومە سەر قەلا، ئاوڕێکی دواوەم دایەوە بۆ ئەوەی بزانم چەندێکم بڕیوە نەك بۆ ئەوەی بزانم چەندم ماوە، لەو کاتەدا وێڵ بووم لە نێوان چاوم و هۆشم، چاوم تۆڕە سەیرەکەی بازاڕەکانی هەولێرم نیشان دەدات... وێڵبوون لە ڕێگەکان. وێڵبوونێك لە بۆنەکان. وێڵبوونێك لە ڕەنگەکان.. بازاڕێك دەتباتە ناو بازاڕێکی دیکەوە، لەگەڵ هەموو گۆڕینێکیش کالاکانیش دەگۆڕێن. بۆنەکان تێکەڵ دەبن. بۆنی قەتیسییەکەی بەڕەی دروست کراو لە پێستەی بزن، تێکەڵ بەبۆنی بەهارات و پەنیرەکان دەبێت. لەولاشەوە جەنجاڵییەکی ڕەنگەکان وێڵت دەکات. ئای کورد چەند حەزی لە زۆری ڕەنگ و گەشانەوەیەتی لە جلوبەرگی ئافرەتەکانیان. ڕەنگەکان ورم دەکەن کاتێك لەسەر ڕەفی دوکانەکان و تۆی قوماشەکانەوە بەرەو چاوم دێن.. پێم سەیرە چۆن ئەو هەموو جەژنانە لە کراسی بەری ئافرەتێکدا کۆ بووەتەوە؟!

چاوم لە نێوان ئەم بازاڕانە و جوولانەوەی خەڵکەکە و دەنگی ئۆتۆمبێلەکاندا سوور دەخوات.. هۆشم بەئاگام دەهێنێتەوە " تۆ ئێستا بەسەر شەش سەردەم و شەش هەزار ساڵ کە بەسەر یەکدا کەڵەکە بووە، لە ژێر شاری چوار خواوەندەکەدا (ئەربائیلۆ) سەردەکەوی. ئەو منداڵانەی

بەدەورمدا ڕایان دەکرد و دەخولانەوە نازانن لەسەر چی ڕادەکەن، هەروەها ئەو ئافرەتەی ئاوی کردە کوڵانەکە و لە بەرچاوم خۆی شاردەوە، نازانێ ئەو ئاوە ئێستا دەچێتە سەر شارێك لە ژێرەوە ئەو نایبینێت. لە نێوان چاوم و هۆشمدا یەکەمیانم هەڵبژارد، دووەمینیشم هەڵگرت بۆ کتێبێك لەسەر مێژووی هەولێر لە بازاڕی کتێبفرۆشەکان کڕیم.

بەپێچەوانەی گوندە بەستەڵەکییەکانی کوردستان، کە خاڵی بوونە لە دانیشتوانەکانی، ئێستا شارەکان پڕبوونە لە خەڵکی گوندەکان. سوپایەك لە گەنج و هەرزەکار گوندەکانی خۆیان بەجێ هێشتووە و هاتوونە شارەکانیش بکەن بەگوند. یا بەبێ کار دەسووڕێنەوە یان کاڵای قاچاخ دەفرۆشن. سوپایەکیش لە پیر لەسەر کورسی چایخانەکان ڕاکشاون و زەمەنیشیان لەگەڵ خۆیاندا ڕاکشاند، یا دەنکی تەزبیحەکانیان هەڵدەدەنەوە یان دەست بەقەفی سمێڵەکانیاندا دەهێنن. تێ ناگەم بۆ ئەو گوندە بەپیت و جوانانەیان چۆڵ کرد؟

لە ڕێگە شاخاوییە چەوتەکانی نێوان هەولێر و سلێمانی، هادی حەسەن مەمی (٥٣ ساڵ لە ناحیەی بازیان) بۆمی گێڕایەوە چی بەسەر ئەو پیرانەدا هاتووە کە لە ناو کۆمەڵگەی زۆرەملێ ژیاون:

*لە ساڵی ١٩٧٨ هەموو گوندەکانیان ڕووخاند و ئێمەیان بۆ کۆمەڵگە زۆرەملێیەکان برد، لەوێ لەگەڵ ئاژەڵەکانمان کەوتینە سەر یەکتریدا.

گەیشتینە بارزان بەڵام بەپێچەوانە، واتا لەو ڕێگەیەوەی کە بۆسەمان بۆ دوژمن لە ژێر چیای پێرس دادەنایەوە، لەگەڵ وریاییەکی زۆری ڕێگە قیرتاوەکە، کە هەردەم ئەگەری ئەوەمان دەکرد کە زرێپۆشەکانی حکومەتی لێوە بێت. جاران دەگەیشتمە ئەم جێگەیە لە ڕێگەی زنجیرە چیاکانی مەتینەوە بەسەر ئەو گوندانەی کە حەوت عەشیرەتەکانی بارزانیی لێیە. لە گوندە نەگبەتەکانی ئەو دۆڵانەدا ئافرەتەکان بەسەبر و دان بەخۆگرتنێکی سەیرەوە پیر بوون لە چاوەڕوانی مێردە

ڕفێندراوەکانیان. تا ئێستاش هیچ هەواڵێکیان نییە، تەنیا مقۆمقۆ نەبێت کە باسی ئەوە دەکات گوایە بۆ تاقیکردنەوەکانی مادە ژەهراوییەکانی لەناوبردنی کیمیاوی بەکار هێنراون. منداڵەکانیش گەورە بوون بێ ئەوەی باوکیان ببینن. لە یەکێك لەو گوندانە نانی ئێوارەمان دەخوارد، کاتێك ئافرەتێك هەویری دەشێلا خۆی بەسەر یەکێك لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو شۆڕا کرد و بەتووڕەییەوە پێی گوت:

-لەو عارەبەی تەنیشتتەوە بپرسە، بزانە هیچی دەربارەی پیاوەکانمان نەبیستووە؟

هاوڕێ کوردەکەم وەڵامی دایەوە:

- لە کوێ بزانێ؟ ئەو تەنانەت هەواڵی خێزانەکەی خۆشی نازانێت.

ژنەکە هەر کۆڵی نەدا و بەدەم هەویر شێلانەکەوە دووبارە گوتی:

-لەگەڵ ئەوەشدا لێی بپرسە، لەگینە سەرەداوێکی پێ بێت.

هەستم بەشەرمەزاری کرد، کە ئەو پێنج هەزار کەسەم لە خەیاڵی خۆم دانەنابوو، کە لە شەوێکی وەك قیامەت ڕفێندران. ئەو شەوەی مغاویرەکان وەك جەیشی یەئجووج و مەئجووج بەهەلیکۆپتەر لە سەربانی ماڵەکان دابەزین و لاقەکانیان کردەوە و چەکەکانیان ڕوو کردە ئەو پیاوانەی دەست و چاویان بەسترابووەوە و قیژەیانیش لە ئافرەتەکان قەدەغە کرد.

هەندێکی دیکەش خەریکبوون بەخێرایی بەنزینیان بەناو ماڵەکان و دارەکان و کۆگەکانی زەخیرەدا دەکرد.

- دوا دیمەن کە بینیم ماڵەکەمان بوو کاتێك دەسووتا و ئاگری لێ بەرز دەبووەوە.

بەنێو ئەو هەموو گوندە کارەساتدارانەدا تێپەڕین و بەسەرهاتەکانیمان لەگەڵ ئەو پیارسکە خواردنانەی بێوەژنەکان بۆمانیان ئامادە کردبوو وەك ئامانەتێك هەڵگرت و بەرەو چیای شیرین هەڵکشاین، کە دەڕوانێتە ناوچەی بارزان، تا گەیشتینە لووتکە گڕکانییە ڕووتاوییەکەی، ئینجا

بەرەو خوار بووینەوە بەنێو ئەشکەوت و کانییە ئاوەکاندا، تا گەیشتینە بنکەکانمان لە بارزان، کە ساڵی ١٩٨٤ لەو هودنە لەرزۆکەی نێوان ئێمە و ڕەبایەکانی حکوومەت لەسەر لووتکەکانی پێرس.

ئێستا بەشێوەیەکی پێچەوانە گەیشتمە ئەو شوێنانە لە ڕێگە قیرتاوەکانی حکوومەتەوە، پرسیارم کرد: ئەو بنکانەی ساڵی ١٩٨٧ لە ترسی چەکی کیمیاوی لێی کشاینەوە چییان لێ هات؟ ئەو هاوڕێیانەی کە لە نەوەی کۆچدا سێیەمن لە من حاڵی نەبوون. چونکە کاتی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە لە ناو کۆمەڵگەی پەنابەراندا منداڵ بوون، هیچ دەربارەی ئەو ڕۆژانە نازانن تەنیا لە ڕێی گێڕانەوەی گەورەکانەوە نەبێت. لە نێو ئەو هاوڕێیانەدا کوڕێك هەبوو ناوی حەسەن بوو، باوکی لە کاتی هەڵمەتی سەر گوندەکانی بارزان گیرا و لە ناو زیندانەکانی حکوومەتدا شەهید بوو.

ئەم ناوچەیە شکۆمەندی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە گۆڕی سەرکردە مستەفا بارزانی لێیە، کە بەبێ هەڵگرتن و جوانکاری لە ژێر کۆمەڵە بەردێکدایە. بۆیە ئێستا بووەتە شوێنێکی پارێزراو، ڕاوکردنی ئاژەڵ تێیدا قەدەغەیە، بۆیە باڵدارەکانی گەورە بوونە و لەنزیکی ئێمەوە خەریکی چوونەکردن بوون بەبێ ئەوەی شپرزە بن و سەیری ئەملاو ئەولای خۆیان بکەن. ئاسکەکانی بەلەنجەوە دەڕۆیشتن بەبێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوە، بەرازەکانیشی بەقەد گۆلکێکیان لێ هاتووە، مارەکانیشی بەهەوەستی خۆیان بەنێو دڕك و داڵەکانیدا بەرەو کانیاوەکان دەخشێن. هاوڕێکانمان بەسەر چیاکەدا نەپەڕینەتەوە، لە کانیاوەکانیش ئاویان نەخواردووەتەوە، لە ناو مەغارە هەزار ستوونەکەشیدا نەنووستوون، چونکە ئەوان دێنە ناو شاری باب و باپیرانیان بەئۆتۆمبێلی سەرۆکایەتی و بەسەر شەقامی قیرتاوکراودا. بۆیە بەسەرسوڕمانەوە گوێیان لە قسەکانم دەگرت، وەك بڵێی باسی ژیانێك دەکەم پێوەندی بەئەفسانەکانەوە هەیە.

# شارە مانگرتووەکە

کاتێك بەدەم ڕێگەوە بەرەو سلێمانی دەڕۆیشتین، لە هاوینەهەوارێکی چۆڵدا، بەدەم قسەکردنەوە، یەکێك لە پێشمەرگە دێرینەکان دەستمی ڕاکێشایە ئەملاوە:

- ئەو زنجیرە دوندە بۆرانە دەبینی؟ لە پشت ئەو چیایەوە.

بەحاڵ دوو لووتکەی نزیك یەکم بینی، تەم و گژنگ دەوری دابوون.

- ... ئەوە چیای قەندیلە!

هاژەی گەلییەکە و خواردنە پڕ چێژەکە و کۆکاکۆلا و ئوتومبێلە ڕیزکراوەکان لە چاوەڕوانی ئێمەدا، هەموویم خستە پشتم و لە کەندەکە نزیك بوومەوە. لە کۆمەڵەکە دابڕام، کەوتمە گەڕان لەسەر ئەو لووتکە چیایانە، کە بەگووانی مانگا دەکەن بەشێوەیەکی سەرەوخوار. لە یادەوەری ڕۆژی ٣١- ٥- ١٩٨٣ دەگەڕام. خۆم بینی لەسەر ئەو لووتکە چیایە، هەتا ناوتەنگەم بەفر هاتووە، دۆڵی پشتاشانم لە دوامەوە بەجێ هێشت، شریقەی تۆپ و دەنگی گوللە لە ناویدا زایەڵەی دەهات و ئاگریشماڵە شکۆمەندەکانی دەسووتاند، لەگەڵ کۆمەڵێك شەهید و سەدان هەڤاڵ نازانم چارەنووسیان گەیشت بەچی. وێنەی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە، کە بەرۆکی خەونەکانم بەرنادات، وەك ناونیشانی چەند بەشێك لە ڕۆمانەکەم تێپەڕی: ڕزگارکردنی لووتکەکان، ڕووخانی لێوجە و زێوە، ئینجا گەمارۆدانی پشتاشان، ئاگرخستنەوەی کاغەزەکان و لەناوبردنی کۆگەی چەك و تەقەمەنییەکان، ئینجا بڕیاری کشانەوە بەرەو چیا...

کاتێك بەرەو دەشتاییەکە شۆڕ بووینەوە، چیاکە لێمان نزیك بووەوە،

پایەتەختی ڕۆحییانە. شارێکی مانگرتووە بەوپەڕی مانای وشە و ڕژێمی پێشوو نەیتوانی ڕای بهێنێت، بۆیە پێی باش بوو بیکات بەزیندان. لە سەرەتای حەفتاکان لە بیرمە وەك شاندێکی ڕۆژنامەوانیی فەرمی دیدەنیم کرد، ئەو کات ڕێنوێنییەکانی ئەو سەربازەی ڕابەری گەشتەکەمانی دەکرد ئەوە بوو:

- متمانەتان بەم شارە نەبێت، ئەم شارە بۆسەیە!

ئێمەی برد بۆ هۆتێلێك بەمۆڵگەکانی سەربازی گەمارۆ درابوو، نیشانگرەکانیش چوارچێوەی سەربانەکەیان تەنی بوو. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئاگەداری کردینەوە کە لەسەر چرپایەکان نەنووین:

-بەشەو لەسەر زەوی بنوون، ئەوە بۆ ئێوە باشترە، چونکە یاخیبووان بەشەو لە چیاکان دێنە خوارێ و درزە دەکەنە نێو شوێنە نزیکەکانەوە.

بەرۆژ پاسەوانەکان ئێمەیان برد بۆ بازاڕ و لە بناگوێمان چرپاندیان:

- هەموو ئەم فرۆشیارانەی خۆیان بەفەقیر نیشان دەدەن، یارمەتی یاخیبووان دەدەن، بۆیە لێمان دوور مەکەونەوە!

ئەندازەی شاری گەمارۆ دراو، وای لە بەرژەوەندیی ڕژێمی پێشوو کرد، کە شەقامی شەست مەتری لە دەوری شارەکە دروست بکات، بۆ ئەوەی جووڵانەوەی ئۆتۆمبێلە سەربازییەکانیان لە بنکەکانی خۆیانەوە بۆ گەمارۆدانی شارەکە بەدرێژایی ئەم شەقامەدا خێراتر بێت. ڕژێم توانی دووجار شارەکە لە چیاکان جیا بکاتەوە. واتا جیاکردنەوەی خەڵکە بێ دەسەڵاتەکەی لە چەکدارانی چیا. نموونەییترین مەشقیش ساڵی ١٩٨٥ بوو، کاتێك هاوپەیمانیەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەگەڵ حکوومەتدا شکستی هێنا، بۆیە زرێپۆش و ئۆتۆمبێلەکانی ڕژێم لە ماوەی چەند خولەکێکدا گەمارۆی شارەکەیان دا و ٦ هەزار لایەنگری حزبەکەیان دەستگیر کرد. پێش ئەوەی شارەکە لەو شۆکە بەئاگا بێتەوە، لە هەمان ڕۆژدا ١٥٠ تەرمی کادیرەکانی کە لە هەڵمەتی تۆقاندنی شارەکەدا

گوللەباران کرابوون درانەوە باوەشی خاوەنەکانیان. لە دوای شکستی راپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١ جارێکی دیکە دووبارە کرایەوە، بەڵام بەشێوەیەکی خێراتر.

لە وڵاتێکدا ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو دەیهەژێنێت، سلێمانی بەهۆی ئەو نیمچە ئاسایشەیەوە گۆڕاوە، ئەو گەشانەوە نارێکە گۆڕیویەتی. بەدرێژایی شەقامی سالم کە بەناو شارەکەدا دەڕوات، ڕووکەشێك لە تاوەری پلاستیکی هەیە چوارچێوەی پەنجەرە گەورەکانی تاریك کراوە، کە ئیحای قەبەیی و گۆنگی و جیاکردنەوەی ناوەوە لە دەرەوە دەبەخشێ. باڵەخانەی ئەمریکایی هیچ پێوەندییەکی بەشارە شاخاوییەکەوە نییە. بازاڕە کۆنەکەشی تژی بووە لە کاڵای پلاستیکی کۆسمۆپۆلۆتی.. شارێکە دەیەوێ لە خودی خۆی ڕابکات بەپەنابردنە بەر ڕووکەشێك هیچ پێوەندییەکی بەوەوە نییە. توێژی ڕۆشنبیری ئێرە پێوەندیی بڕیوە بەبزووتنەوەی نوێگەری لە ڕۆشنبیریی عەرەبی. تەنانەت بەرەو جیابوونەوەیەکی ڕۆشنبیری ڕەگەزپەرستیتر لە جیابوونەوەی سیاسی دەڕوات. دوای ئەوەی ئەدیبەکانی یەکێتی خۆیان دامەزراند، نایانەوێ هیچ پەیوەندییەکیان هەبێت بە یەکێتیی ئەدیبانی عێراقەوە. هەروەها ڕۆژنامەنووسەکانیان دوای ئەوەی سەندیکای خۆیان دامەزراند ئێستا هیچ پێوەندییەکیان بە سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقییەوە نەماوە. بەپێچەوانەی سەرکردە سیاسییەکانیان، کە دەیانەوێ پێگەیەکی کاریگەریان لە حکوومەتی مەرکەزی هەبێت دوای ئەوەی لە دەسەڵاتی خۆیان لە هەرێمەکەدا دڵنیا بوون. ڕۆشنبیرە کوردە نەتەوەییەکان و حزبییەکان هەموو گرەوەکەیان لەسەر دۆزی نەتەوەیی خۆیان داناوە، کەمترین گرەویش لەسەر قووڵکردنی دیموکراتییە لە دەرەوەی دەسەڵاتی هەردوو حزبەکە.

لە هەموو دیدارێکدا باسی نووسینەکانی من دەکەن، بۆیە هەست بەتاوان و کەمتەرخەمی دەکەم، چونکە دوورترین ڕۆشنبیری لە منەوە لە

ڕووی کات و شوێن و ئەزموونەوە دەخوێنمەوە، کەچی هیچ دەربارەی نزیکترینیان نازانم، کە ڕۆشنبیریی کوردییە.

لە دوا گەشتم لە بەغداوە بۆ کوردستان، چل تەرمی بێ سەرم لە دوای خۆمەوە بەجێ هێشت کە لە یەك ڕۆژدا سەربڕابوون. گەیشتمە جێ و ترسی بۆمبی چێنراو لە ناخمدا مابوو، زۆر بەزەحمەت دەروونم هێور بووەوە کاتێك بەوریاییەوە هەستم بەئاسایش دەکرد لە کوردستان. چاودێری خێرایی بەرزبوونەوەی باڵەخانەکانم دەکرد، بەهێوان لەگەڵ گەشتەکەی پێشووم بۆ ئێرە، هەروەها بڵاوبوونەوەی کۆمپانیا بیانییەکان و زۆری خەڵکی بیانی لە هۆتێلە نمرە یەکەکان، هەستم بەوە کرد کە من لە دوو زەمەنی جیاوازدا دەژیم: زەمەنی کوردستان کە وڵات لەسەر هەموو خراپەکانییەوە بنیات دەنرێت و شار و کۆمپانیاکان لەم نیمچە ئاسایشەی گەمارۆ دراو بە ئیمپراتۆریاتی ناحەز بەکورد دروست دەبن. لە ئاستی ئەمەشدا زەمەنی بەغدا، کە وڵات هەڵدەوەشێت و لە ناوچەی سەوز گەمارۆ دەدرێت و دوا بنەماکانی شارستانییەتمان بەبۆمبی چێنراو و چەکدار و دەسەڵاتی ئایینی بڕووخێت، کە دەیەوێت بەو دژایەتییەی، تاڵیبانێکی عێراقی بەبێ هیچ شێوەیەکی خۆشی دروست بکات... بێدەنگییەکە تەواو سەرنجمی ڕاکێشا، لەو کاتەی لە باخچەی هۆتێلەکە دانیشتبووم و سەیری دەرچوونی ئاوەکەم دەکرد لەسەری ئافوورەکەوە، لەم ساتەدا دەستم دەهێنا بە لەشما لە تاوی ئەو کزە سەرمایەی ئێواران و بەغدا و هەواڵە خەمناکەکانیم لە مێشکی خۆم دوور دەخستەوە، سەرەڕای ئەوەی کە دەمزانی ماوەی دوو ڕۆژ لە بەردەممەوە دوورە.

## پەراوێزەکان:

١- لە ١٢ی ئەیلوولی ١٩٨٤ بۆ یەکەم جار ژمارەیەکی ترسناکی ڕووداوی ئۆتۆمبێل بڵاو کرایەوە لە کاتی جەنگدا، ژمارەی کوژراوەکان گەیشتە ١٣٦٧١ هەزار، برینداریش ٨٢٦٧١ هەزار لە نێوان ساڵانی ١٩٨٠ -١٩٨٤، واتا بەرێژەیەکی زیادبوونی ساڵانە دەگاتە ٢٧٪، ژمارەکانیش نیشان دەدات کە زۆربەی قوربانییانی ڕووداوەکان تەمەنیان لە نێوان ١٨-٤٠ ساڵاندایە، واتا تەمەنی عەسکەری!

پێوەرێکی تریش هەیە بۆ بەرزبوونەوەی توندیی دڵەڕاوکێ لە نێو ئەوەکانی ئەو سەردەمەدا، لە نامەیەکی ماستەر کە قوتابی "فایزە حەیدەر" پێشکێش بەبەشی داوودەرمانی زانکۆی بەغدای کردووە، بینرا کە ٣٢,٦٪ی ئەو کوڕانەی لە ئامادەیی و کۆلێجن (تەمەنی عەسکەری!) بەئیدمان جگەرە دەکێشن، ئەم ڕێژەیەش بەرز دەبێتەوە لە دوا ساڵانی خوێندن (پێش چوونیان بۆ عەسکەری لە بەرەکانی جەنگ) واتا دەگاتە ٦٥,٦٪ ئەم زانیارییانە لە گۆڤاری ئەلف با، لە ژمارەی شوباتی ١٩٨٤ بڵاو کراوەتەوە.

٢- دوای دەستپێکردنی جەنگ، یەکە و ڕاست ڕژێمی عێراقی سیاسەتی دەرگای کراوە لە ڕووی دەستی کاری میسریدا پەیڕەو کرد، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٨٥ زیادبوونێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی بەرێژەی ٣٢,٢٪ سەرەڕای نهێنی ژمارەی میسرییەکان لە عێراقدا، کەچی لایەنە بەرپرسە میسری و عێراقییەکان باسی ئەوە دەکەن کە ملیۆن و ڕوبعێك میسری لە عێراقدان، کە دەکاتە ٤٢٪ی ئەو میسرییانەی لە دەرەوەی وڵاتی خۆیاندان، بەڵام هەندێکی تر بەدوو ملیۆن دایدەنێن، لەوانەیە ٤ ملیۆنیش بن. ئەم دەستی کارانە جێگەی عێراقییەکانیان گرتەوە، کە لە جەنگدا بوون، ئەمەش بووە هۆی دروستبوونی جۆرە ڕقێك و کاری توندوتیژی زۆر.

٣- دوای زنجیرەیەك شکات و نارەزایی کە ئێران بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی بەرز کردەوە، بەتاوانبارکردنی عێراقی بەوەی غازی خەردەل بەکار دەهێنێت، تیمی وڵاتە یەکگرتووەکان پاش ئەوەی سەردانی ئێرانیان کرد لە ١٣ - ١٩٨٤/٣/١٩

بۆیان ڕوون بووەوە کە غازی خەردەل و غازی ئەعساب لە خاکی ئێران دراوە، دوای ئەوە لیژنەکە سەلماندی کە عێراق ئەم غازانەی بەشێوەیەکی بەربلاو لە شەڕەکانی فاوی ساڵی ١٩٨٦ بەکار هێناوە، بۆیە یەکەم تاوانی لە لیژنەی ئاسایشی نێودەوڵەتییەوە دژی عێراق دەرکرد. بەڵام بەکارهێنانی ئەم غازانە لە ناوەوە تا دوای قەسابخانەکەی هەڵەبجە هیچ بایەخێکی نێودەوڵەتی بەخۆیەوە نەبینی.

٤- لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە "کرسان موفید" ئەنجامی داوە، گەیشتە ئەوەی کە زەرەری ئابووری ئێران و عێراق لە جەنگەکەدا گەیشتە ١٠٩٧ ملیار دۆلار، بەشی ئێران ٦٤٤,٣ ملیار دۆلار بوو، بەشی عێراق ٤٥٢,٦ ملیار دۆلار بوو.

٥- ڕۆژنامەی سەورە لە ١٩٨١/١/٢٠ چاوپێکەوتنێکی سەدامی لەگەڵ ڕۆژنامەنووسێکی میسری دووبارە بڵاو کردەوە، تێیدا ڕۆژنامەنووسەکە لە سەدام دەپرسێت، کە ئایا ئەو تاوانەی کە ئەنوەر سادات دەیخاتە پاڵ ڕژێمی عێراقی ڕاستە کە دەڵێت ڕژێمی عێراقی ڕژێمێکی خوێناوییە، لە وەڵامدا سەدام دەڵێت: "سەبارەت بەوەی ئێمە خوێناوین، واتا هەر کەسێك خیانەت لەم وڵاتە بکات ئێمە سەری پەل دەدەین، بەڵێ هەرکە زانیمان وایە سەری دەپەڕێنین بەبێ بەزەیی و لە بەرچاوی خەڵکیش.. باو و باپیرانیشمان لە سەرەتای ئیسلامەوە هەر وایان کردووە".

٦- خوێنەری بەڕێز "زوهێر جەزائیری" کۆمەڵێکی تری سەرچاوە بەکار هێناوە بۆ نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە، زۆربەیان ڕۆژنامە و کۆوارەکان و ڕاپۆرتەکانی ساڵانەی بەعسن، لەگەڵ کۆمەڵێك وتار و لێکۆڵینەوەی نووسەرانی عەرەب.

٧- خوێنەری بەڕێز، سەرەڕای ئەوەی ئێستا سەردەمی ئازادییە و سەدام بوو بەڕابردوو، بەڵام لەبەرئەوەی بەشی یەکەمی ئەم نووسینە لە سەردەمی سەدام نووسراوەتەوە، بۆیە فرمانەکانی ناو نووسینەکە بەڕانەبردوو ماوەتەوە و باسی کاتێك دەکات کە هەموومان تێیدا لە میحنەت بووین و ژیانمان لەسەر دەستی دێوەزمە بوو!

-وێنەکان لە ئەنترنێتەوە ورگیراوە

وەرگێڕ

## پێڕست